# هەنار

گۆڤارێکی
ئەدەبیی،
هونەریی،
رووناکبیرییە

74

نەورۆز 2712
مارس 2012

منتدى إقرأ الثقافي
WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

- مەرگی ئیبراهیم یونسی — و. حەمە قادر
- نهێنی گوڵ ناتەواوەکانی رەعنا — چنوور سەعیدی
- سێکوچکەی رۆمان و نهێنگەکانی کاری چیرۆکڤانی — حەمەکەریم عارف








گۆڤارێکی ئەدەبیی، هونەریی، ڕووناکبیرییە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
مانگانە دەریدەکات

ژمارە ٧٤، ساڵی حەوتەم، نەورۆز ٢٧١٢ی کوردی، مارس ٢٠١٢ی زاینی

خاوەنی ئیمتیاز
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سەرنووسەر
محەمەد کوردۆ
mhamadkurdo@yahoo.com

جێگری سەرنووسەر
محەمەد عەبدوڵڵا

بەڕێوەبەری هونەریی و نەخشەسازیی
پەیام ئەحمەد

web:www.hanar.org

Email:hanarkurd@gmail.com
Email:hanarkurd@yahoo.com

ناونیشان: گردی ئەندازیاران، بەرامبەر ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ
تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩



دەستەی نووسەران:
کارزان عەبدوڵڵا
ئەکرەم محەمەد ئەمین
نەورۆز جەمال
مستەفا زاهیدی

هەڵەچن:
مونا عەبدوڵڵا
ئاشنا جەمال

مۆتیف:
چنار جەلال

١

تیراژ
٥٠٠

# پێڕست

## لێکۆڵینەوە



## دەق

## وەرگێڕان



## هونەر

# سێکوچکەی
# ڕۆمان
# و
# نهێنگەکانی کاری چیرۆکڤانی



**حەمەکەریم عارف**

-١-

ئـەدەب لە وڵاتانی پاشکەوتوودا ناکاتە شتێکی گرینگ و کاریگەر، بۆیە بە زۆری دەکەوێتە پەراوێزی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە و وەکو کارێکی لاوەکی تەمەشاو مومارەسە دەکرێت، بەڵام ئەدەبیات بە گشت ژانر و لق و پۆپەکانییەوە، لە دێر زەمانەوە کەڵکەڵەو خولیایەکی حەڵاڵ و ڕەوای مرۆڤانی بووە و مرۆڤ هەوڵیداوە لەو ڕێگایەوە جۆرە نەمری و جاویدانییەک بە خۆ و بە ژیانی خۆی ببەخشێت، خۆی بۆ نەوەکانی دوای خۆی بگێڕێتەوە و ببێت بە بەشێک لە باکراوندی یادەوەرییەکانی وەچە یەک لە دوای یەکەکانی تیرەی بەشەر و بە ئاسانی لە بیر نەچێتەوەو لە یادگە نەسڕدرێتەوە.. ئەگەر لە ڕۆژگارانی کۆنی پێش مێژوودا، بەشەر ئەم خولیا و کەڵکەڵانەی لە ڕێگای نەخش و نیگارانەوە لەسەر بەرد و داروديواری شکەفتاندا بەرجەستەکردبێت، ئەوا لە سەرەتای دەستپێکی مێژووەوە، ئیدی لە ڕێگای وشەو کەرەستەی تری دەربڕینەوە گوزارشتی لە خولیا و خەون و خەیاڵ و ئومێد و نائومێدییەکانی خۆی کردووەو نیشانی داون. هەڵبەتە هەموو کەسێک ئەو توانا و بەهرەیەی نەبووەو نییە. ئێمە لێرەدا کە زیاتر قسەمان لەسەر ئەدەب و نووسینە، بۆیە زیاتر دەست لەسەر وشە دادەگرین، لە ئەدەبدا وشەو پەیڤ کەرەستەیەکی

ئەفسووناوییە، تەنیا خەڵکانی ئەفسوونکار، واتا ئەدیب دەتوانن بە شێوەیەکی ئەفسووناوی ئەوتۆ بەکاری بێنن کە گەشکەو لەزەتێکی ئەستاتیکی بە رۆحی وەرگر ببەخشێت. ئەمەش خۆ بەخۆ و لە خۆڕا نایەتە دی و بەهرەیەکی خۆڕسکی خودادادی نییە، بەڵکو مەیل و ئارەزوویەکی ئاشقانەی ئەوتۆیە کە حەجمین و حەوانەوە لە هەڵگرەکەی هەڵدەگرێت و لە روحیا پەنگدەخواتەوە و هەموو خەمێکی دەبێت بە مومارەسەکردنێکی ئاشقانەی ئەو مەیل و ئارەزووە، هێندەی مومارەسەی ئەو مەیل و ئارەزووەی لە لا مەبەستە، ئەوەندە شۆرەت و دەسکەوت و قازانجی مادی -ئەگەر هەبێت- لەلا گرینگ و مەبەست نییە. بە کورتییەکەی نووسین و ئاشقێنی دەگەڵ وشەدا لەلا دەبێ بە باشترین شێوازی ژیان. یانی مەیل و ئارەزوو خاڵی دەستپێکی نووسین و نووسەرایەتییە. هەڵبەتە مەیل و ئارەزوو جۆرە توانایەکی خۆڕسکە. خەڵکانێک، چ نێر چ مێ هاندەدات ژیانی خۆیانی بۆ تەرخانبکەن، چونکە پێیانوایە تەنیا لەم رێگەیەوە دەتوانن خودی خۆیان بسەلمێنن، ودەگەڵ خودی خۆیاندا بسازێن و گەشکە بە رۆحی خۆیان ببەخشن. دیارە ئەم مەیل و ئارەزوو و بەهرە خۆڕسکە، شتێکی قەدەری نییە لە چارەی هەندێک کەس نووسرابێ و لە چارەی هەندێکی دی نەنووسرابێت، بەڵکو توانایەکی خۆڕسکی ریشە ئاڵۆزە و بە هەوڵ و کۆشش و لێبڕان گەشەدەکات و پەرەدەسەنێت و هەندێجار دەگاتە ئاستی بلیمەتایەتی. بۆیە ئەو کەسانەی لە تەمەنی منداڵی یان لە سەرەتای هەرزەکارییەوە، بەو دنیایەی کە تیای دەژین نارازین و بە خەیاڵ دنیایەک چێدەکەن کە لە زۆر رووەوە لە دنیای واقیع جیاوازە، ئەمە خۆی لە خۆیدا دەستپێک و سەرەتایە بۆ ئەو شتەی کە پێی دەگوترێت مەیل و ئارەزووی ئەدەبی. دیارە ژمارەی ئەوانەی کە دەتوانن بە باڵی خەیاڵ بفڕن و لە دنیای واقیعی و ژیانی راستەقینە دوور بکەونەوەو بە پەیڤ و وشە دنیاێن باشتر و جوانتر دروستبکەن، زۆر کەمە... تەنیا ئەو کەسانە ئەمەیان لێدەوەشێتەوەو لە دەست دێت، کە لە ساتێکی تایبەتیدا بڕیاری ئەوە بدەن ببن بە نووسەر و خۆیان دەربەست بۆ نووسین تەرخان بکەن و مەیل و ئارەزووە زەینییە خۆڕسکەکەیان لە رێگەی وشە و لە ناو وشە و بە وشە بەرجەستە بکەن. بۆیە هەر بەرزەخەیاڵی و خولانەوە لە بازنەی خەیاڵدا بە تەنیا بەس نییە، بەڵکو دەبێت لە رێگەی نووسینەوە بەرجەستە بکرێت، ئەو واقیعە وەهمییەی لە خەیاڵداندا ئاولەمە بووە، بە نووسین بسپێردرێت، هەرچەندە ئەمە هەنگاوێکی فرە گرینگە بەرەو دنیای نووسەرایەتی، بەڵام ئایندەیەکی نووسەرایەتی ئەوتۆ بۆ هیچ کەسێک وەکو

نووسەر زامن ناکات، بەڵام مکووڕبوون لەسەر ئەوەی ببی بە نووسەر و بڕیاربدەیت ژیانی تایبەتی خۆت لە قەبەڵی ئەم پرۆژەیە بکەیت، تاقە ڕێگەیە کە لەگینە بتخاتە سەر سەرەتای ڕێگەی بە نووسەر بوون.

بەم پێیە خەیاڵ دەکاتە سەرچاوەی مەیل و ئارەزووی نووسەرایەتی و رەگێکی خەیاڵیش دەچێتەوە سەر یاخی بوون، ئەوەی بە باڵی خەیاڵ دەفڕێ و ئاسمانی ژیانە خەیاڵکردەکان دەخاتە ژێر باڵی فڕینەوە، بەمە جاری یاخیبوون دەدات، یاخیبوون لە دنیای واقیعی، لەو ژیانەی کە هەیە، دەیەوێ دنیاو ژیان بگۆڕێت بەو دنیایەی کە بە خەیاڵ دروستی دەکات، جا هەرچەندە ئەمە پرۆژەیەکی خەیاڵییە، بەڵام لە هەمان کاتدا پرۆسەیەکی ئەفراندنەوانی (ابداعی) زۆر تایبەتییە، بە شێوەیەکی زاتی و مەجازی و نامێژوویی دێتە دی و لە مەودای دووردا بە درێژا کار لە دنیای واقیعی، واتە لە ژیانی خەڵکی ناو واقیع و ناو ژیانی ئاسایی دەکات. جا ئەم نارازی بوونە بە واقیع و بە ژیان وەکو چۆن هەیە، یەکێکە لە نهێنییەکانی زەرووڕەتی بوونی ئەدەب. هەڵبەتە ئەو ژیانەی کە دەقی چیرۆکڤانی، بە تایبەتی دەقی زۆر پوختەی هونەری، بەرجەستەی دەکات و پیشانی دەدات، هەرگیز ئەوە نییە کە داهێنەرەکەی تیایدا ژیاوە و بە کردەوە جەرباندوویەتی، بەڵکو ئەو دنیاو ژیانەیە کە بە ئاواتی خواستووەو لە ژیانی واقیعیدا پێی نەگەییوە، بۆیە پەنای وەبەر خەیاڵ بردووەو لە ڕێگەی خەیاڵەوە ژیانی دڵخوازی خۆی چێکردووەو بە شێوەیەکی خودی و ناڕاستەوخۆ، بە دەم خەون و خەیاڵەوە، مومارەسەی ئەو ژیانەی کردووە. هەڵبەتە خەیاڵ بۆ خۆی پەردەیەکەو دراوە بەسەر حەقیقەتێکی گەلەک گەورەدا، دراوە بەسەر ئەو ژیانەدا کە نەبووە.. ئەو ژیانەی لە سەردەمان و ڕۆژگارانێکدا پیاوان و ژنانێک خەویان پێوە دیتووە، بە عەزرەتییەوە بوون و هەوڵیان لە پێناوی وەدیهاتنیدا داوەو پێی نەگەییون، بۆیە چاریان ناچار بووە کە بە خۆیان بیخوڵقێنن، دروستی بکەن، لە نەبوونەوە بیهێننە بوون. واتە ئەم پرۆسەیە ڕێک بە پێچەوانەی کاری مێژووەوە، نەهاتووەتە سەر حازرەکی و ئەوەی هەیەو ڕوویـداوە بگێڕێتەوەو تۆماربکات، بەڵکو سەرو ساختی دەگەڵ ئەو شتەدایە کە ڕووی نەداوە، بۆیە چاری ناچارە پەنا وەبەر خەیاڵ و پەیڤ بەرێت و بە جۆرێ بیخوڵقێنێ و بیافەرێنێ کە لە گشت کەموکوڕی و کێماسی و بۆشایی و بێدادی و نامرادییەکانی ژیانی ڕاستەقینەو واقیعی بەدەربێت.. دیارە ئەم پرۆسەیە ڕەگێکی دەچێتەوە سەر یاخیگەرێتی، ئەم گەمەیە بە ڕواڵەت گەمەیەکی بێوەی و بێ مەترسییە.. هەڵبەتە هەر گەمەیەک

سنوور و بازنەی مەیدانی تایبەتی خۆی نەبەزێنێت و خۆی لە ژیانی واقیعی هەڵ نەقورتێنێت، هیچ مەترسییەکی نابێت و زەرەری بۆ پەزی کەس نابێت.. بەڵام گەمەی ئەدەب لەگەمە بێوەیەکان نییە، چونکە خەیاڵ کە رەگەزی هەرە بنەڕەتی ئەدەبە، خۆی لە خۆیدا زادەی نارەزاییەکی جدییە دەرهەق بە ژیان وەکو هەیە، ئیدی لێرەوە دەبێت بە سەرچاوەی تورەیی و بێزاری و نارەزایی و کاتێ خوێنەر لە میانەی رۆمانانی مەزنی خەیاڵییەوە دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە دنیای واقیعی و ژیانی رۆژانە، هەرگیز راستگۆیی ئەو ژیانەی تێدا نییە کە رۆماننووسان خوڵقاندوویانە و ئەفراندوویانە، ئەوسا دەگەڕێتەوە بۆ ناو ژیانی راستەقینە و بە هەستیارییەکی زیاتر و بێدارییەکی پترەوە رووبەڕووی کەموکوڕی و سنووردارییەکانی ژیان دەبێتەوە. بە نیگەرانییەکی تەواوەوە رووبەڕووی دنیای واقیعی دەبێتەوە و ئەم نیگەرانییە کە ئەدەبی رەسەن و چاک لە دڵ و دەروونان دروستی دەکات، لەگینە لە هەلومەرجی خۆیدا بگۆڕێت بۆ هەڵوێستی یاخیبوون لە دەسەڵات، دامودەزگا کارگێڕی و بیرو باوەڕە باوەکان. بۆیە لە دێر زەمانەوە دەسەڵات هەوڵیداوە ئەدەبی رەسەن قەدەغە بکات و لە رێگەی سانسۆرەوە دەستەمۆ و کەوی بکات. هەڵبەتە دەسەڵاتبازان و دەسەڵاترانان لەمەدا بە هەڵە نەچوون، چونکە پرۆسەی ئەفراندنی چیرۆکێن خەیاڵی، هەرچەندە بە رواڵەت زۆر بێوەیە و ئاشتی لێدەبارێت، بەڵام لە کرۆک و جەوهەردا شێوازێکە لە شێوازە شارستانییەتەکانی ئازادیخوازی و بانگەوازی یاخیبوونە دژ بەوانەی کە دەیانەوێ ئازادی نەهێڵن و دەست بخەنە بینی ئازادی. جا ئیدی چ خەڵکانی ئاینی بن چ سکۆلاریست. ئەمە هۆیەکە لەو هۆیانەی کە گشت دکتاتۆرییەتەکانی دنیای هانداوە راستەوخۆ و ناراستەوخۆ ئەدەب بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو لە قاڵبی سانسۆری بدەن و بە هەموو شێوەیەک کۆت و زنجیری بکەن.

***

بە هەرحاڵ با بێینەوە سەر ئەسڵی بابەت و مەبەستەکەی خۆمان و کە مەیل و ئارەزووی ئەدەبی بوو.. هەڵبەتە مەیل و ئارەزووی ئەدەبی سەرگەرمی و کاتبەسەربردن نییە، وەرزش نییە و گەمەیەکی ناوازەش نییە کە لە کاتی دەست بەتاڵیدا مومارەسە بکرێت، بەڵکو جۆرە کۆیلایەتییەکە کە نووسەر بە خوایشتی خۆی هەڵیدەبژێرێت. واتە نووسەر دەبێت ژیانی خۆی لە قەبەڵی نووسین بکات و بە تەواوەتی خۆی بۆ تەرخان بکات. کەواتە نووسین مێمڵ ئاسا لەسەر ژیانی نووسەر دەژی و فلۆبیر گوتەنی: "نووسین رێبازێکە

لە ڕێبازەکانی ژیان... یان ئەو کەسەی کە نووسین وەکو شێوەیەکی ژیان هەڵدەبژێرێ و دەچێتە ژێر ئەو بارە جوان و لە هەمان کاتدا قەرسەوە، بۆ ئەوە نانووسێت کە بژی، بەڵکو دەژی بۆ ئەوەی بنووسێت و بەبێ ئەدەب هەڵناکات و ئەدەب دەبێت بە داینەمۆی بوون و مانی". ئەدەب لە لای دەبێت بە جۆرە ئاینێک کە ئامادەیە هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان بکات و خەمی بەرودوای دەبێت بەوەی بەرهەمێکی زندووی ئەوتۆ بئافەرێنێ کە سنووری زەمان و سەردەمان ببەزێنێت و لە دوای ئەو بژی... بە کورتییەکەی ئەوەی دەیەوێ ببێ بە ئەدیبی ڕاستەقینە، دەبێ لە ڕادەبەدەر ئەدەبی خۆش بوێت و بە جۆرێ ئالودەی ببێت، کە نە تەماح و نە هەڕەشە نەتوانێت پێی تەرک بکات و هەموو جوانی و لەزەت و خۆشییەک لەو ئالوودەبوونەدا ببینێت.

-٢-

هەڵبەتە یەکێک لە سەرچاوە هەرە گرینگەکانی دنیای چیرۆکڤانی و رۆمان، ئەزموونی خودی نووسەر و ژیانی ڕۆژانەیە، یان بە گوتەیەکی دی خوێندنەوەی هونەریانە ژیانی ڕۆژانە و چۆنییەتی گۆڕینی ئەو ئەزموون و ژیانە ڕۆژانەیەیە بۆ هەست. دیارە ئەمەش بەو مانایە نییە کە چیرۆک یان ڕۆمان ئۆتۆبیۆگرافییەکی موو بە مووی نووسەرە، بەڵام بمانەوێ و نەمانەوێ خودی نووسەر و ئەزموونەکانی ژیان بە شێوەی هونەری و ناڕاستەوخۆ لە دەقی چیرۆک و ڕۆماندا ڕەنگدەداتەوە، واتە بەم پێودانگە خەیاڵیترین ڕۆمان و چیرۆک ڕەگێکی لە واقیعدایەو لەلایەن نووسەرەوە جووتێ باڵی خەون و خەیاڵی لێنراوە تا بتوانێت سنووری واقیع ببەزێنێت و لە ئاسمانی حەزەکانی نووسەردا، بەرزەفڕی خۆی بنوێنێ و بەلای کەمەوە لەزەتێکی ئەستاتیکی بە وەرگر ببەخشێت. دیارە هەر نووسەرەش شێوازی تایبەتی خۆی هەیە بۆ هونەراندنی ژیان و ئەزموونەکانی ناو ژیان. جا نووسەر دێت زۆر وەستایانە ئەو دیاردەو ڕووداوانە، ئەو کەس و کەسایەتیانە، ئەو بارودۆخەی کە شوێنەوارێکی لە یادگەیدا بەجێهێشتووە و خەیاڵیان جوڵاندووە، وەکو کەرەستەیەکی خاو هێندە وەستایانە لە بونیادی کارەکەی خۆیدا، بەکاردێنێت، دنیایەکی هونەری پڕ ئەفراندنەوانی و فلیڤانی (ابداعی) هێندە دەوڵەمەند و ڕەنگاو ڕەنگ و ئەفسووناوی لێدروست دەکات، کە مەحاڵە بتوانی ئەو کەرەستە خاوانەی کە تیایدا بەکارهاتوون و بوون بە سەرچاوەی ئەو کارە فلیڤانیە بناسیتەوە. واتە وەکو چۆن مەنجەڵێک شیری کوڵاو کە هەوێنی تێدەکرێت و پاش ئەوەی دەمەیێت و قەوارەی خۆی وەردەگرێت، نەک هەر

شێوەو ناوەرۆک بەڵکو ناوەکەشی دەگۆڕێت و کەس هەوێنەکەی بۆ لە تێکڕای بەرهەمە تازەکە بۆ جیاناکرێتەوە، دەقی رۆمان و چیرۆکیش ئەو کەرەستە خاوانە لە خۆیدا هەرس دەکات و دەتوێنێتەوە و جیاکردنەوەیان لە خودی دەقەکە مەحاڵ دەبێت، ئەمە ئەو هەودا زۆر ناسک و پەنهانەیە کە خەیاڵیترین دەقی چیرۆک بە واقیعەوە دەبەستێت.

***

جا ئێستا با بێینە سەر بابەت و تیمەو ناوەرۆک. رۆماننوس زیاتر لەسەر خۆی دەژی. خۆی سەرچاوەی خۆراکی هونەریی خۆیەتی، دێت چینە لە ئەزموونەکانی خۆی و دەوروبەر و ژینگەی خۆی دەکات، نەک هەر بۆ ئەوەی هەندێ کاراکتەر و کەسایەتی، یان رووداو، یان هەندێ دیمەنان لە بنەبانی یادگەو یادگارەکانەوە هەڵگوێزێ و وەکو خۆیان دایان بڕێژێتەوە، بەڵکو خەون و خەیاڵەکانی خۆی پێ دەمەزەرد بکاتەوە و بە پشتیوانی خەون و بەرزەخەیالاّن، بکەوێتە هونەراندنی بابەتەکەی و لە چوارچێوەی رۆماندا، کە پرۆسەیەکی ئەفراندنەوانی یەجگار هەستیار و قورسە، بەرجەستە بکات و خۆی لە باری قورسی ئەو بابەتە رزگار بکات کە بەرۆکی گرتووە.. بەم پێیە نووسینی رۆمان یان چیرۆک، وەکو چۆن لە دایکبوونی منداڵ، باری دایکەکەی سووک دەکات و جۆرە ئاسوودەییەکی روحی و دەروونی پێدەبەخشێت، بەو ئاوایە باری نووسەر سووک دەکات و جۆرە ئازادییەکی پێ دەبەخشێت، یانی بابەت بەرۆکی نووسەر دەگرێت، تا بە وشەو پەیڤانی بسپێرێت و لە کارێکی فلیڤانی راستەقینەدا، کە دەکاتە رۆمان، سەربەخۆیی هونەری و ئەستاتیکی خۆی رابگەیەنێت و خوێنەر بخاتە سەر باڵی خەیاڵ و بە ئاسمانی خەونانیدا بگێڕێت و بە جۆرێکی ئەفسوون بکات کە لە کانگای دڵەوە بڵێت خۆزی تەواو نەدەبوو. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا گرینگی و زەرورەتی خەیاڵی قەناعەتبەخش لە کاری رۆمان و چیرۆکڤانیدا دەگەیەنێت. خۆ ئەگەر بمانەوێ خەیاڵ لە قاڵبی پێناسە بدەین، دەکرێ بگوترێ کە جۆرە خاپاندنێکە (خەڵەتاندن)، واقیعێکی ناواقیعیەو وادەنوێنێ کە واقیعییە. بەم پێیە هەر رۆمانێک بگری، درۆیەکە، هەوڵدەدات وەکو راستی و حەقیقەت بنوێنێ. نووسەری چاک و بەهرەمەند بە زەبری تەکنیکی تایبەتی بە جۆرێکی دەهونەرێنێ کە قەناعەتبەخش بێت و متمانەی خوێنەر بە دەست بێنێ.. بۆیە نووسەر دەبێ بە پیری ئەو بابەتانەوە بچێت کە هاندەرێکی رۆحیان لە پشتەوەیە. چونکە ئەو بابەتانەی کە خۆ بەخۆ بەرۆکی نووسەر دەگرن خۆشتر دێنە دەستەوە لەو بابەتانەی کە نووسەر

هەڵیان دەبژێرێ و بە تۆبزی بەرۆکیان دەگرێت. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە بابەت بۆ خۆی و لە خۆیدا و بەتەنیا لە دنیای ئەدەبدا ناکاتە هیچ و گرینگییەکی ئەوتۆی نییە و هەڵسەنگاندنی ئەدەبی لەسەر ڕۆنانرێ، چاکی و خراپی لە خودی بابەتەکەدا بەرجەستە نابێت، بەڵکو لەوەدا دەردەکەوێ کە چۆن ئەو بابەتە دەگەڵ تێکڕای ڕەگەزەکانی دیدا ئاوێتە دەکرێت و دەگۆڕدرێت بۆ ناوەرۆک و تیمە و لە قاڵبی ڕۆماندا بەرجەستە دەبێت و قەوارەی خۆی وەردەگرێت و ئەدەبییەت و ژیانی تایبەتی خۆی پەیدا دەکات. واتە تەکنیک و چۆنییەتی مامەڵەکردن و خوێندنەوەی نووسەر بۆ بابەتەکە و گۆڕینی بۆ واقیعێکی پەیڤەوانی (کلامی) ڕێکوپێک و باڵاتر لەو واقیعەی هەیە، پێوەر و پێوانەیە بۆ دیاریکردنی سەرکەوتن یان بەسەر سەرا کەوتنی کاری ڕۆمانەوانی...

-٣-

هەڵبەتە مەسەلەی قاڵب و فۆرم و شێوەش هەڵوەستەیەکی گەرەکە. بێگومان ڕۆمان لە میانەی فۆرمەوە بەرجەستە دەبێت و شەقڵ و مۆرک و تەبیعەتی دیارو ئاشکرای خۆی وەردەگرێت، بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەلا عەیان بێت کە شێوەو ناوەرۆک بە جۆرێ ئاوێتەی یەکن کە لە جیابوونەوەو جیاکردنەوە نایەن ، مەگەر بە ناچاری و بە مەبەستی توێژینەوەو شیکردنەوە. چونکە ئەوەی ڕۆمان دەیگێڕێتەوە، لە شێواز و چۆنییەتی گێڕانەوەکە جیا ناکرێتەوە، هەر شێواز و چۆنییەتی گێڕانەوەیە کە قەناعەتی هونەری لەلای خوێنەر دروست دەکات و وای لێدەکات پەیگیری بابەتەکە بکات یان نا، واتە یەکێک لە مەرجەکانی شێواز و چۆنیەتی گێڕانەوە ئەوەیە قەناعەتبەخش بێت.. بۆ نموونە ئەگەر یەکێک بێت بە شێوەیەکی لامسەرلایی بۆت بگێڕێتەوە کە بابەتی ڕۆمانی (مەسخ)ی کافکا بریتییە لەوەی کە فەرمانبەرێکی بچووک دەگۆڕێت و دەبێت بە سیسرکێکی قێزەوەر، ڕەنگە لە دڵی خۆتا بڵێیت جا من چ مەجبوورم وەختی خۆم بەم درۆزلەوە بکوژم و بە فیڕۆ بدەم.. بەڵام کاتێ دێیتە سەر گێڕانەوە ناوازەکەی خودی کافکا، بە جۆرێ ئەفسوون دەبیت، بەتەواوەتی باوەڕ بەو گۆڕانە ترسناکە دەکەیت و لێت دەبێت بە ڕاستێک لە سەرووی هەموو ڕاستییەکانەوەو بە خوایشتی خۆت ئاوێتەی دەبیت و لە گەڵیدا دەژیت و وەکو واقیعێکی سەربەخۆ و باڵاتر لەو واقیعەی کە هەیە، مامەڵەی لەتەکدا دەکەیت. چونکە شێوازو چۆنییەتی گێڕانەوەکە لە ڕادەبەدەر قەناعەتبەخشە، ئەو قەناعەتبەخشییە یەکێکە لە نهێنییەکانی ڕۆمان و چیرۆکی باش و سەرکەوتوو.

هەرکاتێ رۆمانێک ئەو هەستەی لا دروستکردین کە لە واقیعی واقیعی رزگار بووە، خۆیبوونی خۆی بەدەستهێناوە، کەسایەتی سەربەخۆی خۆی هەیە، بە بوونی خۆیەوە بەندەو گشت مەرجەکانی ژیانی هونەری لە خۆیدا هەڵگرتووە، مانای وایە گەییوەتە لوتکەی قەناعەتبەخشی، هەنگێ دەتوانێت خوێنەرانی خۆی ئەفسوون بکات و وایان لێبکات نەک هەر باوەڕی پێ بکەن، بەڵکو ئاوێتەی ببن، لە ناویا و لەگەڵیدا بژین، بەلأم وێڕای هەموو ئەمانەش پێویستە ئەوەمان لەلا عەیان بێت کە شێوەو نێوەرۆک بە جۆرێ ئاوێتەی یەکن و لە بۆتەی هونەردا قاڵ دەبنەوە کە لە جیابوونەوەو جیاکردنەوە نایەن. بە هەرحاڵ شێوەو فۆرم لە دوو رەگەز پێکدێت کە لە رووی گرینگی و بایەخەوە هاوتا و یەکسانن، هەرچەندە پێکەوەو لە ناو یەکتردان، بەلأم هەندێجار بە ناچاری و بەمەبەستی توێژینەوەو شیکردنەوەو شرۆڤە جیادەکرێنەوە. ئەو دوو رەگەزە بریتین لە شێواز و نەسەق، شێواز وەکو ئاشکرایە، پەیوەندی بە وشە، بەو بونیادەوە هەیە کە چیرۆک یان بابەتی پێدەگێردرێتەوە، نەسەقیش بریتییە لە رێکخستنی ئەو کەرەستە و رەگەزانەی کە چیرۆکەکە یان بابەتەکەیان لێ پێکهاتووە، یانی بە کورتی و کرمانجی پەیوەندی بە تەوەرە گەورەو سەرەکییەکانی بیناو بونیادی رۆمانەوانی و حیکایەتەوانییەوە هەیە: گوتیار (راوی)، شوێن و کاتی چیرۆکڤانی..

-٤-

هەڵبەتە شێواز، هەرچەندە تاقە رەگەز نییە لە بونیاد و پێکهاتەی رۆماندا، بەلأم رەگەزێکی یەجگار هەستیار و جەوهەری و سەرەکییە. دیارە رۆمان لە وشە و پەیڤان پێکهاتووەو پێکدێت، بۆیە شێواز دەکاتە بەکارهێنانێکی هونەریانەی ئەو وشانەی کە چیرۆکەکەیان پێدەگێڕدرێتەوە، ئیدی لە میانەی شێوازەوە ئەوە دەردەکەوێت کە ئەوەی گێڕدراوەتەوە، واتە بابەتەکە بە گوێرەی واقیعی چیرۆکەکە و لەناو واقیعی چیرۆکەکەدا قەناعەتبەخشە یان نا، کە ساغبوونەوەی ئەم لایەنە هاوتای راگەیاندنی ژیان یان مەرگی رۆمانەکەیە، بەلأم دەبێت ئاماژەش بۆ ئەوە بکرێت کە زمانی رۆمان لە بابەتی رۆمان نایەتە جیابوونەوەو جیاکردنەوە، چونکە بابەت لە چوارچێوەی وشەو زماندا بەرجەستە دەبێت و تەنیا لەم رێگایەوە دەزانرێ کە ئاخۆ نووسەر لە کارە حیکایەتەوانییەکەیدا، لە گێڕانەوەکەیدا سەرکەوتووە یان نا. ئەو چیرۆکە خەیاڵییەی کە بە زمان و لە ناو زماندا بەرهەمی هێناوە توانای ژیانی هەیە،

لە داهێنەرەکەی جیابووەتەوە، خۆبوونی خۆی وەرگرتووە، لە واقیعی واقیعی دوور کەوتووەتەوە و توانیویەتی وەکو کارێکی هونەری، وەکو واقیعێکی باڵای سەربەخۆ، خوێنەر کەمەندکێش بکات؟. واتە زندوویەتی یان مردوویەتی، کارایی یان سستی نووسین لە چۆنییەتی گێڕانەوەی بابەتەکەیدا بە دیار دەکەوێ و بەرجەستە دەبێت.. رەنگە ئەم بۆچوونە سەرنج و خەیاڵی خوێنەر بۆ لای بیرۆکەی زەرووڕەتی سەلامەتی و ساغڵەمی زمان رابکێشێت، چونکە وەکو گوتمان شێواز بە کورتی و بە کوردی بریتییە لە چۆنییەتی مامەڵەکردن دەگەڵ زمان و پێکهاتەکانی زماندا لە ناو ئەو کارە ئەدەبییەی کاری لەسەر دەکرێت، بەڵام بەو مانایە نییە کە سەلامەتی و تۆکمەیی زمان مەرجی زۆر گرینگی زمان بێت، سەلامەتی یان ناسەلامەتی شێواز گرینگ نییە، گرینگ ئەوەیە کارا و ئەکتیڤ بێت، پڕ بە پێستی ئەرکی خۆی بێت، کە بریتییە لەوەی رۆح و ژیان بە بەر ئەو چیرۆک و بابەتەدا بکات کە دەیگێڕێتەوە. هەڵبەتە زۆر کەڵە نووسەر هەن بە شێوازێکی یەجگار ساغڵەم و تۆکمە و بتەو، بە گوێرەی دەستوور و یاساو رێسا زمانەوانییە باوەکەی سەردەمی خۆیان بەرهەمی زۆر ناوازەو شاکاری نەمریان نووسیوەو شۆرەتی ئیقلیمگیریان پەیداکردووە، بۆ نموونە ستندال، دیکنز و،گابریل گارسیا مارکیز... هتد، بەڵام لە هەمان کاتدا نووسەرانی دیکە هەن کە لە هیچ روویەکەوە لەوان کەمتر نین و شێواز و زمانیان لە رووی ئەکادیمییەوە پڕە لە هەڵەو پەڵە و ئەمە نەک هەر نەیکردووەتە کارێک کە پایەی بەرزی هونەریان بێتە خوارێ، بەڵکو لێشیان بووە بەنەخش و بە یەکێک لە تایبەتمەندیی بەرهەمیان حەساو دەکرێت، بۆ نموونە وەک بەلزاک و جۆیس.. کەواتە ساغڵەمی شێواز و زمان بە تەنیا و پێشوەختە شتێکی ئەوتۆی دەربارەی هەڵسەنگاندنی دروستی یان نادروستی چیرۆک لەسەر رۆنانرێت.

ئەوەی لە چیرۆکدا گرینگە و بە پێوەری کارایی و ئەکتیڤی نووسینی رۆمانەوانی دادەنرێت، ئەوەیە کە چەند لە ناوەوە یەکگرتووبێت و چەند شەقڵ و مۆرکی پێویستی خۆی وەرگرتبێت.. رەنگە ئەو چیرۆکەی لە میانەی رۆمانێکەوە دەگێڕدرێتەوە زۆر سفت و یەکگرتوو نەبێت، بەڵام پێویستە ئەو زمانەی کە پێی بەرجەستە دەکرێت، زمانێکی سفتی ئەوتۆ بێت کە شاشی خودی چیرۆکەکە بشارێتەوەو لە بونیادێکی هونەری رەسەندا و بە تەکنیکێکی ئەوتۆ کە ژیانی لێ هەڵبقوڵێت، بەرجەستەی بکات. یانی ئەوەندەی یەکگرتوویی و سفتی شێواز گرینگە، ساغڵەمی زمان لە رووی دەستووری و ئەکادیمییەوە،

به تەنیا و پێشوەختە، وەکو ئەوزارێکی گێڕانەوە، گرینگ نییە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە زمانی ڕۆمانەوانی، زمانێکی قەناعەتبەخش بێت و کارێکی وەها بکات کە خوێنەر هەست بە هیچ بۆشاییەک نەکات لە نێوان بابەتەکە و ئەو وشانەی بابەتەکەیان پێدەگێڕدرێتەوە. ئەمەش بەوە دێتە دی کە شێواز بە ڕادەیەک قەناعەتبەخش بێت، کە وشەو کاراکتەر و بابەت و نێوەڕۆک و هەموو ڕەگەزەکانی چیرۆک بە جۆرێ ئاوێتەی یەکدی ببن و یەکەیەکی یەکپارچەی هونەری سفت و کۆکی ئەوتۆ پێکبهێنن کە تەنانەت بە خەیاڵیش ئەوەمان بە بیردا نەیەت کە لەگینە لێکدی جیاببنەوە یان جیابکرێنەوە، ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی هەر کارێکی سەرکەوتووی فلیڤانی (ابداعی) و لە شێوازی زۆربەی هەرە زۆری گەورە نووسەراندا هەستی پێدەکرێت و دەبینرێت. بۆیە شێوازی ئەو کەڵە نووسەرانە، بە هۆی شەقڵ و هاماجی (فەزا) تایبەتی خۆیانەوە نایەنە لاسایی کردنەوەو ئەگەر لاساییش بکرێنەوە، ئەوا بەرەنجامی لاسایی کردنەوەکە بە زۆری شتێکی کاریکاتێری دەردەچێت نەک شتێکی ڕەسەن... بۆیە کاتێ هەندێ ڕۆمان و چیرۆکان دەخوێنینەوە، چەند خەیاڵییش بێت، بێ دوو دڵی باوەڕی پێدەکەین، ئەم باوەڕکردنەش لەو وشانەدایە کە بابەتی ڕۆمانەکەی پێ هاتووەتە گێڕانەوە. لە شێوازو لە ریتم و ئاهەنگی گێڕانەوەو بەرجەستەکردنی هونەریانەی بابەتەکەدایە، ئەگەر لەو وشەو شێواز و ریتمە تایبەتییەی داببڕیت، ناتوانیت بەو شێوەیە ئەفسوونمان بکات، چونکە ڕاستت گەرەکە ئەو بابەتانەی لە ڕۆمانەکەدایە، دەکاتە خودی ئەو پەیڤ و وشانەی سەرلەبەری ڕۆمانەکەی پێ گێڕدراوەتەوە. بۆیە کاتێ کە نووسەرانی دی دێن و لاسایی ئەم شێوازە دەکەنەوە، ئەو ئەدەبەی لەم پرۆسەیەوە بەرهەم دێت، کاڵ و کرچ و قەڵب و جەڵەبی دەردەچێت و زیاتر لە کاریکاتێر دەچێت.. ڕەنگە هەندێ لەو لاساییکەرەوانە خوێنەرانێکی زۆر پەیدابکەن و شۆرەتێکی ڕەوتەنی بە دەست بێنن، بەڵام کارەکانیان هەرگیز ڕەسەنایەتی نەمر پەیدا ناکەن و چەندیش پەردەپۆش بکرێن، لاسایی کردنەوەکەیان پێوە دیار دەبێت و خۆیان جاڕ لە خۆیان دەدەن. ئەدەب فێڵێکی گەورەیە، بەڵام ئەدەبی ڕەسەن و گەورە دەتوانێت بە ئەفسوونی خۆی ئەو فێڵە وەشێرێت و ئەدەبی خراپ و ناڕەسەن و جەڵەبی بە پێچەوانەوە، فێڵەکە لە قاو دەدات.

کەواتە لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامگیرییەی شێوازی یەککگرتووی لەبار و گونجاوی سفت و کۆک، مەرجێکی سەرەکی ڕۆمانەو دەکاتە ڕەگی ژیانی ڕۆمان، ئەمەش لە خۆڕا بە دەست نایە، گەڕان و دۆزینەوەی دەوێت، خوێندنەوەی

زۆری دەوێت، چونکە مەحاڵە بە بێ خوێندنەوەی زۆر، زمانێکی دەوڵەمەندی خۆشدەستی رەوانی بە رێژەوی برەوداری پڕگوزارشت بە دەست بێت. هەڵبەتە خوێندنەوەش، بە تایبەتی خوێندنەوەی جددی پیاو دەخاتە ژێر کاریگەریی ئەو رۆمان و بەرهەمانەی دەیخوێنێتەوە، ئەفسوونی ئەو نووسەرانەی دەکات کە خۆشەویستی ئەدەبی دەخەنە دڵ و دەروون و لێرەوە ئەگەر پیاو ئاگای لە خۆی نەبێت لاسایی کردنەوە دەست پێدەکات... جا هەر لاسایی کردنەوەیەکی ئەوانە ئاساییە، تەنیا لاسایی کردنەوەی شێوازی نووسین و بەرهەمەکانیان نەبێت، نابێت بە هیچ جۆرێ شێواز و چۆنییەتی مامەڵەکردنیان دەگەڵ زمان و وشەدا کۆپی بکرێتەوە، چونکە نووسەر کە نەیتوانی شێوازی تایبەتی خۆی، شێوازی هەرە گونجاو و لەبار بۆ ئەو بابەتەی کە گەرەکیەتی بیگێڕێتەوەو هونەریانە پیشان بدات، بدۆزێتەوەو بەرهەم بێنێت، زۆر ئەستەمە چیرۆک و رۆمانەکانی بگاتە ئەو ئاستەی قەناعەت بە خوێنەر بکەن، ببن بە بەرهەمی قەناعەتبەخش، کە ئەم قەناعەتبەخشییە ژیانی ئەدەبەکەی مسۆگەر دەکات. بەم پێودانگە شێواز بە مانایەک دەکاتە ئەوپەڕی وردی لە هەڵبژاردنی وشەدا، چونکە تەنیا وشەی دانسقە و بە دیقەت هەڵبژێردراو دەتوانێت گوزارشت لە بیرۆکە بکات و بەرجەستەی بکات. جا دانسقەیی وشەش زیاتر بە ریتمەکەیدا دەناسرێتەوە.. بە هەرحاڵ ئەگەر بڵێین شێوازو فۆرم یەک شتن رەنگە نەبێت بە زێدەرۆیی، چونکە نووسین لایەنێکە لە لایەنەکانی فۆرمی ئەدەبی، دیمەنێکە لە دیمەنەکانی شێوەی ئەدەبی و دیمەنێکی دیکەی هەیە کە لە رووی گرینگی و بایەخەوە هیچی کەمتر نییە لە شێواز، ئەویش تەکنیکە، چونکە وشە (شێواز) بە تەنیا دەرەقەتی گێڕانەوەی چیرۆکێکی باش نایەت..

-٥-

رۆمان، وەکو بونیادێکی هونەری لە کەرەستەو تفاق و رەگەزی جۆراو جۆر پێکهاتووە، بەڵام هێندە وەستایانەو قەناعەتبەخش دروستکراوە لە تۆ وایە ژیانی لێ هەڵدەقوڵێت، لە تۆ وایە یەکەیەکی یەکپارچەی سەربەخۆی خۆزاد و خۆژییە، بەڵام ئەمە تەنیا رواڵەتە، ئەگینا لە بنج و بناواندا سەربەخۆیەکی خۆزاد نییە. ئەم وەهمە بە زەبری ئەفسوونی چۆنییەتی نووسینەکەی و وەستایی دروستکردنەکەی چێبووە، واتە بە زەبری شێوازی چیرۆکڤانی دروستبووە... کە پێشتر باسی گرینگی و بایەخی شێوازمان لە کارێن چیرۆکڤانیدا کرد، ئێستاش جێی خۆیەتی هەڵوەستەیەک لە ئاستی تەرتیب و رێکخستنی ئەو

کەرەستە و رەگەزانە بکەین کە رۆمانیان لێ پێکدێت، هەڵوەستەیەک لە ئاستی ئەو تەکنیکانە بکەین کە رۆماننووس بەکاریان دێنێت، تا شەقڵ و وزەیەکی ئیحایی تەواو بە داهێنانەکەی خۆی بدات.. کۆڵەکە هەرە گرینگ و بنەڕەتییەکانی رۆمان بریتین لە گوتیار، شوێن، کات، و ئاستی واقیع...

گوتیار، هەر بە ناوەکەیدا دیارە، ئاماژەیە بۆ ئەو کەسەی کە چیرۆکێک یان هەرشتێکی دی دەگێڕێتەوە، ئیدی ئەو گێڕانەوەیە چ بە زارەکی بێت چ بە نووسین بێت. لە چیرۆکدا، گوتیار دەشێت نووسەرێک بێت و راستەوخۆ و بە زمانی خۆی بدوێ یان دەمامکێک بێت، یان یەکێک بێت لە کاراکتەرەکانی چیرۆکەکە، کە نووسەر بۆ گێڕانەوەی چیرۆکەکەی خۆی خوڵقاندووە... کاتێ گوتیار سەروکار دەگەڵ رووداوەکانی چیرۆکدا، چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوەی رووداوەکاندا، پەیدا دەکات، روانگە و گۆشەنیگای یەکەم کەسی تاک یان کۆ (من، ئێمە)، دووەم کەس (تۆ، ئێوە) و سێیەم کەس (ئەو، ئەوان)ی لێدەکەوێتەوە... کە هەر یەکێک لەم سێ گۆشەنیگایە، چەندین جۆریان هەیە.. گۆشەنیگاش بریتییە لەو شێوازەی کە نووسەر لە رێگەیەوە تیمە و بابەت و رەگەز و پێکهاتەکانی چیرۆکەکەی خۆی بە خوێنەر نیشاندەدات و ئەوەی راستی بێت پەیوەندی نووسەر بە چیرۆکەکەوە نیشاندەدات. هەر چیرۆکێک پێویستە گوتیارێکی هەبێت کە بابەتێک بگێڕێتەوە، گێڕانەوەی بابەتیش لە رێگەی یەکەم کەس یان دووەم کەس یان سێیەم کەسەوە ئەنجامدەدرێ..جا بەم پێودانگە گوتیار گرینگترین کاراکتەرە لە هەموو رۆمانێکدا و هەموو کاراکتەرەکانی دیکە بە دەوری ئەودا دەسوڕێنەوە.. هەڵبەتە گوتیار، واتە ئەوەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، چەندیش بشوبهێتە سەر نووسەری چیرۆکەکە و ئەگەر بە راناوی یەکەم کەسیش چیرۆکەکە بگێڕێتەوە، ناکاتە خودی نووسەر و کۆپییەکی موو بە مووی نووسەر نییە. جارێ گوتیار بوونەوەرێکە لە وشە دروستکراوە، تەنیا لە بازنەی ئەو چیرۆک و رۆمانەدا دەژی کە دەیگێڕێتەوە. واتە بوونی بەندە بە رۆمانەکەوەو لە پێش رۆمانەکەدا یان لە پاش رۆمانەکەدا هیچ بوونێکی نییە، بوونی، بوونێکی خەیاڵییە و هەموو دنیای ئەو چوارچێوەی رۆمانەکەیە. ناتوانێت لە دەرێی رۆمانەکەدا هیچ بوونێکی هەبێت. هەڵبەتە دیارە کە نووسەر ژیانێکی هەمەجۆرتر و بە رێژەوتری لە خودی رۆمانەکە هەیە، با ئەویش بینووسێت، چونکە رۆمانەکە چەند زندووش بێت، ناتوانێت هەموو ژیان و ژینی ئەو لە خۆ بگرێت. گوتیار زادەو گوراوی خەیاڵە، وەکو هەر کاراکتەرێکی دیکەی ناو رۆمان، بەڵام لەوان گرینگترە. هەرچی رەفتار و کردار و گوتار و

هەڵوێستێکی هەیە، لە پێناوی یەکێتیی ناوخۆیی ڕۆمانەکەدایە، کە ئەم یەکێتییە ناوخۆییەی پێدروست نەکرێت، توانای قەناعەت بەخشینیشی نابێت...

جا با بزانین کێ چیرۆک دەگێڕێتەوە، یان بە زمانی کێوە دێتە گێڕانەوە. هەڵبەتە هەر چیرۆکێک بگری دەبێت گوتیارێکی هەبێت کە بابەتێک بگێڕێتەوە. جا ئەم گێڕانەوەیە دەشێت لە شێوەو قاڵبی یەکەم کەسدا بێت (من، ئێمە) یان دووەم کەس (تۆ، ئێوە) یان لە شێوەو قاڵبی سێیەم کەسدا بێت (ئەو، ئەوان) واتە گێڕانەوە لەو سێ قاڵبە بەدەر نابێت، یەکەم: گوتیاری قارەمان، واتە گوتیار بە خۆی لە چیرۆکەکەدا بەشدارە و لە ناو چیرۆکەکەوە بابەتەکە دەگێڕێتەوە.. دووەم: گوتیاری هەموو شتزان. ئەم گوتیارە لە دەرێی چیرۆکەکەدایە و وابەستەی ئەو چیرۆک و بابەتە نییە کە دەیگێڕێتەوە، ئاگادارییەکی خوایانەی لە رابردوو، ئێستا و ئایندەی هەموو قارەمانانی رۆمانەکە هەیە، بیرو کرداریان دەخوێنێتەوە و لە گشت هزر و بیرو هەست و نەست و سۆزێکیان ئاگادارە، لە ڕووداوەکان و ئاراستەی ڕووداوەکان ئاگادارە، بە کورتییەکەی لە حوکمی خوایەکە ئاگای لە خشەی مار و مێرووی ناو ڕۆمان و چیرۆکەکە هەیە و پێویستی بەوەش نییە وەڵامی خوێنەر بداتەوە کە ئەو هەموو زانیارییەی لە کوێندەرەوە هێناوە، هەر بۆیەش پێی دەگوترێ گوتیاری هەمووشتزان. سێیەم: گوتیاری گۆنگ (ملتبس): ئەم گوتیارە لەو چیرۆک و حاڵەتانەدا بەکار دەبرێت کە گوتیار نە (من، ئێمە)یەو نە (ئەو،ئەوان)ە، بەڵکو ڕووی دەم لە(تۆ، ئێوە) یە. واتە لە ڕێگەی دووەم کەسەوە، بابەتەکە یان چیرۆکەکە دێتە گێڕانەوە. لەو جۆرە چیرۆکانەدا کە ئەم گوتیارە دەوریان تێدا دەبینێ، تێکەڵەیەک لە هەردوو گۆشەنیگای دەروونی و بیرونی بەکاردەبرێت.. هەندێجار ئەم گوتیارە لە راستیدا، لەژێر پەردەی ڕاناوی دووەم کەسدا(تۆ، ئێوە) خۆی دەنوێنێ. لەم حاڵەدا دەوری گوتیاری قارەمان دەگێڕێت، بەشداری لە ڕووداوەکاندا دەکات، بەڵام ناسنامەی خۆی لە خوێنەر و هەندێجار لە خۆیشی دەشارێتەوە. ناسینی تەواوەتی ئەم گوتیارە کە خۆی لە پشت پەردەی ڕاناوی دووەم کەسدا (تۆ، ئێوە) حەشارداوە، زۆر زەحمەتە، بۆیە گوتیاری (ملتبس- گۆنگ)ی پێدەگوترێ، مەگەر لە ڕێگەی مەزەندەو قەرینە ناوخۆییەکانی خودی چیرۆکەکەوە، پەی پێ ببرێت.. واتە ئەم جۆرە گوتیارە، برێک ئاڵۆز و بە تەمومانە. هەڵبەتە گوتیاری یەکەم و دووەم کۆنن و لە دێر زەمانەوە بەکاردەبرێن، بەڵام گوتیاری سێیەم (ملتبس) تازەیە، زیاتر لەگەڵ پەیدابوون و سەرهەڵدانی ڕۆمانی تازەدا هاتووەتە ئاراوە. بەم پێودانگە ئەگەر گوتیار بە زمانی یەکەم کەس (من، ئێمە) بدوێت ئەوا

گۆشەنیگایەکەی، گۆشەنیگای دەروونی پێدەگوترێ، ئەگەر گوتیار (ئەوەی بابەت یان چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە) یەکێک بێت لە کاراکتەرانی رۆمانەکە و باسی ئەو بەسەرهات و پێشهاتانە بکات کە دێنە رێی خۆی، پێیدەگوترێ گوتیاری - قارەمان. ئەگەر باسی بەسەرهاتی کەسێکی دی بکات، ئەوا پێی دەگوترێ گوتیاری- چاودێر.. واتە گوتیار لەم حاڵەدا، لە چیرۆکەکەدا بەشدارە، دەگەڵ کاراکتەرەکانی دیدا، لە هەمان شوێن و زەمەنی چیرۆکەکەدا دەژی و دەوری زۆر گرینگی لە رەوت و ئاراستەی رووداوەکاندا دەبێت، بەڵام ئەگەر گوتیار، لە قاڵبی سێیەم کەسدا (ئەو، ئەوان) بدوێت بەم شێوە گێڕانەوەیە دەگوترێت گۆشەنیگای بێرونی، لێرەدا گوتیار، لە دەرێی چیرۆکەکەدایە و هەموو شتێک دەزانێت، خودا ئاسا لە هەموو شوێنێ هەیەو لە هیچ شوێنێک نابینرێت. هەموو شتێک دەزانێت، هەموو شتێک دەبینێت، هەموو شتێک دەگێڕێتەوە، بێئەوەی هەرگیز دەربکەوێت، بێئەوەی هەرگیز باسی خۆی بکات.. تەنیا گێڕانەوەیەکی بێ لایەنانەی لەسەرە بێئەوەی راوبۆچوونی خۆی دەرببڕێت... هەڵبەتە ئەوەی تا ئێرە، لەمەڕ گوتیار و گۆشەنیگا، لە رۆمان و جیهانی چیرۆکڤانیدا باسکرا، هێڵە گشتی و درشتەکانی بابەتەکەمانە و ئەو تەقسیمبەندییەی کە کراوە، قاڵبی پیرۆز و لە شکان نەهاتوو نییە، چونکە نووسەر ئازادە لەوەی جێگۆڕکێ بە گوتیارەکانی بکات و کارێک بکات کە رۆمانەکەی زیاتر قەناعەتبەخش بێت. هەڵبەتە زۆر ئاساییە کە گێڕانەوەی رۆمان بە یەک گوتیار نەسپێردرێت، بەڵکو بە پێی پێویستی هونەری و ئەستاتیکی و زەرورەتی قەناعەتبەخشین، بە چەندین گوتیار بسپێردرێت و هونەرنوێنی تیابکرێت. هەڵبەتە ئەمە نەک هیچ زیانێک بە چیرۆک و رۆمانەکە ناگەیەنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەوڵەمەندی دەکات و گوڕ و زندوویەتی پتری پێدەبەخشێت...

کەواتە گوتیاریش وەکو هەر یەکێک لەو کاراکتەرانەی کە باسیان دەکات، زادەو گوراوی خەیاڵە. لە وشە دروستکراوە، نەک لە گۆشت و ئێسقان و خوێن، تەنیا لە رۆمانەکەدا دەژی و بوونی بەندە بە رۆمانەکەوەو خراوەتە خزمەتی رۆمانەکەوە... ئیدی ئەم کاراکتەرە، واتە ئەم گوتیارە دەشێت لە ناو یان لە دەرێی چیرۆکەکەدا بێت یان لە حاڵەتێکی (ملتبس) و گۆنگدا بێت، هەڵبەتە بە گوێرەی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بە زمانی یەکەم کەس یان سێیەم کەس، یان دووەم کەس. هەڵبەتە زۆر دەگمەنە و بگرە مەحاڵە تەنیا یەک گوتیار لە رۆماندا هەبێت. ئەوەی باوە هەر رۆمانێک چەندین گوتیاری هەیە، کە بە نۆرەو دوا بە دوای یەکتر، لە روانگە و گۆشەنیگای جیاوازەوە چیرۆک یان

بابەتی ڕۆمانەکەمان بۆ دەگێڕنەوە و پیشاندەدەن. بە هەرحاڵ هەر تەکنیکێک لە ڕۆماندا بەکاربێت، دەبێت لە پێناوی ئەوەدا بێت کە بابەت و چیرۆکی ڕۆمانەکە، پتر و پتر قەناعەتبەخش بێت و هونەرییانە ژیانی لێ هەڵبقوڵێت و زندوویەتی خۆی بسەلمێنێت...

-٦-

دیارە زەمەن(کات)، وەکو چۆن گێڕانەوەو شوێن لە کاری چیرۆکڤانیدا، کە پێشتر و بە خێرایی باسمانکرد، دەورێکی یەجگار گرینگ دەگێڕن، بەو ئاوایە دەکاتە کۆڵەکەیەکی هەرە گرینگی ڕۆمان و چیرۆک و هیچی لە فۆرمی حیکایەتەوانی و گێڕانەوەکاری کەمتر نییە و چۆنییەتی مامەڵەکردن و مالیجەی زەمەن، دەقاو دەق بە ئەندازەی شوێن، دەور لە توانای قەناعەتبەخشی چیرۆکدا دەبینێت. هەڵبەتە پێویستە لە سەرەتاوە زەمەنی زنجیرەیی (کرۆنۆلۆجی)، واتە ئەو زەمەنەی خوێنەر و خودی ڕۆماننووسانی تیادا دەژین و تیایدا غەرق بوون، لەو زەمەنە خەیاڵکردەی کە دەیخوێنینەوە، کە لە بنەڕەت و جەوهەردا لە زەمەنی واقیعی جیاوازە، جیا بکەینەوە. ئەم زەمەنە ڕێک وەکو چۆن گوتیار و کاراکتەرانی چیرۆک زادەو گوراوی خەیاڵن، بەو ئاوایە خەیاڵی و خەیاڵکردەو گوتیار لە ڕێگەی بەکارهێنانی زەمەنەوە کارەکەی لە جیهانی واقیعی ڕزگار دەکات و سەربەخۆییەکی ڕواڵەتی قەناعەتبەخشی پێدەدات.

هەڵبەتە زەمەن، وەکو ڕەگەزێکی گرینگی دنیای چیرۆکڤانی مایەی ڕامان و سەرنجی زۆر لە زانایان و هزرڤانان و داهێنەران بووەو بیرو بۆچوونی هەمەڕەنگ و جۆراوجۆر و ناکۆکی لەمەڕ چێبووە، بەڵام ڕەنگە هەمووان بەلای کەمەوە لەوەدا کۆکبن کە دوو زەمەن هەیە، زەمەنی زنجیرەیی (کرۆنۆلۆجی) و زەمەنی سایکۆلۆجی. زەمەنی یەکەم، واتە کرۆنۆلۆجی، بە خۆی هەیە و لەسەرووی بوون و دەسەڵاتی ئێمەوەیە و جوڵەی تەنە ئاسمانییەکان و ئەو دۆخە جۆراوجۆرانەی پێ پێوانە دەکرێت کە هەسارەکان لە بەینی خۆیاندا وەری دەگرن، ئیدی بەشەریش وەکو بەشێکی گرینگ لە گەردوون، لە ڕۆژی لە دایکبوونەوە تا مردن مەحکوومە بەو زەمەنە. واتە تەحەکوم لە ئاراستەی ژیانی قەدەریانەی تێکڕای بوون و بوونەوەران دەکات. بەڵام لە پاڵ ئەمەدا، زەمەنێکی سایکۆلۆجیش هەیە، کە بە گوێرەی هەڵوێست و کارو کردەوەکانمان هەستی پێدەکەین. بە شێوەی جیاواز لە هەڵچوون و سۆزو گودازماندا دەردەکەوێ. لە حاڵی خۆشی و شادیدا زۆر بە خێرایی دەقەتێ و دەگوزەرێ و لە ڕووی

دەروونییەوە هەست دەکەین زۆر کورتە، مەسەلەکەش ئەوەیە کە دەمانەوێ ئەو زەمەنە سایکۆلۆجیە درێژە بکێشێت و بە خاوی بڕوات، دیارە پێچەوانەش پێچەوانەیە لە حاڵەتی چاوەڕوانی و داخ و کەسەر و ناخۆشیدا، هەستدەکەین کات ناڕوات، لە جێی خۆی چەقیوە، بارێکی قورسە بەسەر دڵ و دەروونمانەوە، رۆژێکمان لێدەبێت بە ساڵێک، مەسەلەکەش ئەوەیە کە حەزدەکەین، ئەو زەمەنە سایکۆلۆجییە، بەلەز بڕوات. جا لێرەدا زەمەنی رۆمانانمان مەبەستە، کە ئەم زەمەنە لە زەمەنی سایکۆلۆجیەوە هەڵێنجراوەو مامەڵەی لە تەکدا دەکرێت نەک لە زەمەنی کرۆنۆلۆجییەوە. واتە زەمەنێکی زاتی (خودی)یە، مامەڵەی هونەرییانەی رۆماننووس دیمەن و شەقڵێکی بابەتیانەی پێدەبەخشێت تا لەم رێگەیەوە کارێکی وەها بکات کە رۆمانەکەی لە دنیای واقیعی دووربکەوێتەوە و جیاوازو لە هەمان کاتدا قەناعەتبەخش بێت، کە ئەمە کارێکی ئیجبارییە بۆ هەر بەرهەمێکی خەیاڵی کە بیەوێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ، پشت بە خۆی بژی و خۆبیوونی خۆی هەبێت... وەکو چۆن زەمەنی واقیعی خەونێک، لە چەند ساتێک پتر ناخایەنێت، بەڵام لق و پۆپ بۆ زەمەنانی دوور و درێژی چ رابردوو و چ ئایندە دەهاوێت و جاری وایە دەگاتە سەد ساڵ... زەمەنی رۆمانەوانیش، لە رێگەی گێڕانەوەوە، بە زەبری خەیاڵ، لە زەمەنی سایکۆلۆجییەوە لقوپۆپ دەهاوێت و لە پەیڤ و وشەدا بەرجەستە دەبێت و تایبەتمەندییەکی ئەوتۆ وەردەگرێت کە لە زەمەنی واقیع جیاواز بێ و بۆ خوێنەر و لای خوێنەر قەناعەتبەخش بێت. جا بۆ دیاریکردنی خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی زەمەنی رۆمانەوانی، پێویستە لە هەر رۆمانێکدا بۆ گۆشەنیگای زەمانی بگەڕێین و دەگەڵ گۆشەنیگای شوێندا تێکەڵی نەکەین، هەرچەندە هەردوو گۆشەنیگای ناقبری لە مومارەسەی پراکتیکیدا، یەکانگیرو ئاوێتەی یەکترن.. بە هەرحاڵ گۆشەنیگای زەمانی لە هەر رۆمانێکدا بریتییە لەو پەیوەندییەی نێوان زەمەنی گوتیارو زەمەنی ئەو بابەت و شتەی دەگێڕدرێتەوە، ئەمەش بەند و پەیوەستە بە زەمەنی ئەو فرمانە دەستوورییەی کە گوتیار، چیرۆکەکەی لە رێگەوە دەگێڕێتەوە. جا بەم پێودانگە دەشێت:

١- زەمەنی گوتیار و زەمەنی ئەو بابەتەی دەگێڕدرێتەوە تێک بکەنەوەو یەک زەمەن بن. لەم حاڵەتەدا گوتیار، پەنا دەباتە بەر فرمانی رانەبردوو(مضارع) بۆ گێڕانەوەی بابەتەکەی.

٢- گوتیار دەتوانێت لە رابـردووەوە، ئەو رووداوانە بگێڕێتەوە کە لە ئێستادا یان لە ئایندەدا روو دەدەن.

٣- گوتیار دەتوانێت لە ئێستادا یان لە ئایندەدا، ئەو ڕووداوانە بگێڕێتەوە کە لە ڕابردووی دوور یان نزیکدا ڕوویان داوە...

هەر هەموو ئەمەش لە ڕێگەی زەمەنی دەستوورییەوە، واتە ئەو فرمانەی کە گوتیار بۆ گێڕانەوەی چیرۆکەکەی، پەنای بردووەتێ، دەناسرێتەوەو پەی پێدەبرێت. هەڵبەتە ئەو سێ گۆشەنیگا زەمانییە، زۆر لق و پۆپی تریان لێدەبێتەوەو زۆر دەگمەنە تەنیا یەک گۆشەنیگای زەمەنی لە چیرۆک و ڕۆمانانی خەیاڵکردا بەکار ببرێ، ئیدی واباوە کە گوتیار لە نێوان چەندین ڕوانگەو گۆشەنیگای زەمەنی جیاوازدا لە هاتوچۆدا بێت و کاراترین و ئەکتیفترین زەمەنی دەستووری، بە گوێرەی پێویستی ڕەوتی گشتی ڕۆمانەکە، بەکاربێنێ، زەمەنەکان لە ڕابردووەوە بچێتە سەر ئاینده و لە ئایندەوە بگەڕێنەوە سەر ڕابردوو کە ئەمە بۆ بوونەوەرانی واقیعی ناو ژیانی واقیعی مەحاڵە. کەواتە زەمەنی خەیاڵیش، زەمەنێکی دەستکرد و دروستکراوە... هەڵبەتە زۆرجار پتر لە یەک زەمەن لە چیرۆکێکدا دەبینرێ و دوو سێ زەمەن یان چەند سیستەمێکی زەمەنی پێکەوە لە یەک ڕۆمان و چیرۆکدا دەژین...

هەڵبەتە کە باسی ڕەگەزەکانی ڕۆمان، بە جیادەکرێت، تەنیا بە مەبەستی شەرح و شرۆڤە و ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەیە، دەنا ڕۆمان وەکو یەکەیەکی یەکپارچەی هونەری بە تێکڕای ڕەگەزە بنەڕەتی و لاوەکی و وردەکاری و ناسککارییەکانییەوە هونەریەت و ئەدەبییەت وەردەگرێت و تێکڕای ڕەگەزەکان لە بۆتەی هونەردا بە جۆرێ قاڵدەبنەوە کە لێک هەڵاوێرانیان نیمچە مەحاڵ و مەحاڵە.. بۆیە زەمەن لە هەر ڕۆمانێکدا داهێنانێکی فۆرماڵییە، چونکە ئەو چیرۆکەی لە چوارچێوەیدا ڕوو دەدات، نە لە ژیانی واقیعی دەچێت و نە لەگەڵیا تێکدەکاتەوە...

-٧-

شتێک هەیە لە ڕۆماندا پێی دەگوترێت ئاستی واقیع. دیارە ئەمە بۆ خۆی بابەتێکی یەجگار ئاڵۆزەو بەدەم ڕەوتی نەشونماو گەشەکردنی هونەریی ڕۆمانەوە، دنیایەک لق و پۆی لێدەبێتەوەو بە سەرانسەری ڕۆمانەکەدا دەتەنێتەوەو تەرز دەهاوێت و بەشێوەیەکی پەنهانی پەیوەندییە هەڤدژەکانی نێوان واقیعی و فانتازی لە خۆدەگرێت. دیارە ئەم پەیوەندییە بەو ئاوایەی کە گوتیار یان ڕەوتی گشتی چیرۆکەکە بەرجەستەو پێشکەشی دەکەن، هێندەی لق و پۆ لێدەبێتەوە کە لە بڕانەوە نایەت، ئەم لق و پۆ هاویشتنە بە ڕادەیەکە کە هیچ

نابێت بە زێدەڕۆیی ئەگەر بڵێین ڕەسەنایەتی نووسەری ئەدەبی فانتازی، بەر لە هەر شتێک وەستاوەتە سەر ئەو شێوەیەی، کە ئاستی واقیعی لە چیرۆکەکانیدا پێدەردەبڕێت و بەرجەستە دەکات. بەم پێیە ڕەسەنایەتی دەکاتە ئەوەی خۆت بیت، سەربەخۆیی خۆت هەبێت، لە خەڵکانی دی جیاواز بیت، نەفەسی تایبەتی خۆت بە کارە ئەدەبییەکەت بەخشی بێت و لە نێوان هەزاران کاری دیکەدا بناسرێیتەوە. واتە چمکێکی تازەی ژیان، لایەنێکی شاراوەی ئەزموونی مرۆڤانی، ڕیشەیەکی بوونت کەشفکردبێت، کە تا ئەو کاتە فەرامۆش کرابێ یان پەراوێز خرابێت یان لە شیکردنەوەی ڕۆمانەوانیدا ئاوڕی لێنەدرابێتەوە و بە جۆرێ لە سەرانسەری ڕۆمانەکەدا زاڵ بێت، کە نۆڕینێکی تازەمان پێ ببەخشێت کە پێشتر لە ژیاندا باو نەبووبێت. بۆیە نووسەری ڕەسەن دێت لە ڕێگەی بەرجەستەکردن و دەربڕینی هەندێ ئاستی واقیعەوە کە پێشتر باو نەبووە، نەناسراوە،جیهانبینی و نۆڕینە مرۆڤانییەکانمان لەلا قوڵتر دەکەنەوەو لە دڵ و دەروونماندا ڕیشاژۆی دەکەن. واتە ئەدەبی ڕەسەن بە گشتی و ڕۆمان بە تایبەتی، هەست و نەست، سۆز و گوداز، نۆڕین و جیهانبینی مرۆڤ، دەمەزەرد دەکەنەوە و لە ڕۆتینیەت و یەکجۆریی ڕزگاری دەکەن. بە هەرحاڵ ڕەگەزی شوێن و کات و ئاستی واقیع، سێکوچکەی هەر ڕۆمانێک پێکدەهێنن و ڕوانگە و گۆشەنیگای مەکانی و زەمانی و ئاستی واقیعیان لێدەکەوێتەوە. ئیدی چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەو سێکوچکەیە بە شێوەیەکی گونجاو و هاوئاهەنگ لە سەرانسەری ڕۆماندا، ڕادەی یەکێتی و سازانی ناوخۆ و قەناعەتبەخشی ڕۆمان وەکو یەکەیەکی یەکپارچەی هونەری دەنوێنێ، دەکاتە کارێک کە خوێنەر قەناعەت بە حەقیقەت و ڕاستی ڕۆمانەکە بکات. هەڵبەتە حەقیقەت و ڕاستی ڕۆمان لەوەدا نییە بشوبهێتە سەر ئەو جیهانە واقیعییەی کە خوێنەر تیایدا دەژی. سەرچاوەی ئەو حەقیقەت و ڕاستییە، لە خودی ڕۆمانەکەوە، لەو قەوارەیەوە کە لە پەیڤ و وشە دروستکراوە، لە سیستەمی بەکارهێنانی سێکوچکەی نێوبراوەوە هەڵدەقوڵێت.. واقیعییەت لێرەدا ئەوەیە کە بە گوێرەی واقیعی ڕۆمانەکە واقیعی و قەناعەتبەخش بێت، نەک بە گوێرەی ئەو واقیعەی کە خوێنەر تیایدا دەژی. بۆیە ئەگەر وشە و پەیڤان، و سیستەمی ڕۆمانەکە کارابن و دەگەڵ ئەو چیرۆک و بابەتەدا بگونجێن کە دەویسترێ خوێنەری پێ ئیقناع بکرێ، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە دەقەکە لە ڕووی تەکنیکەوە سەرکەوتووە و بە شێوەیەکی هونەریانەی ئەوتۆ بابەت و شێوازو گۆشەنیگا ئاوێتە بوون و تێکهاڵاون کە کاتێ خوێنەر دەیخوێنێتەوە

بە رادەیـەک جەزمە دەیگرێت و حاڵی لێدێت، کە بیری دەچێتەوە رۆمان دەخوێنێتەوە و لە دنیایەکی خەیاڵکردی وشە زادا دەژی، وا هەست دەکات لە ناو ژیانی راستەقینەدا دەژی... ئەمەش بە زەبری تەکنیک دێتەدی. وەکو چۆن خوێن بە دەمارەکانی لەشدا دەسورێتەوە بە بێ ئەوەی ببینرێت، زندوویەتی پێدەبەخشێت، تەکنیکش بەو ئاوایە، بە دەمارەکانی لەشی رۆماندا دێ و دەچێت و زندوویەتی پێدەبەخشێت و بە رادەیەک خوێنەر ئەفسوون دەکات کە بەلای کەمەوە، لە ماوەی خوێندنەوەکەیدا، ئەو دنیا خەیاڵکردە وشەزایەی لێببێت بە ژیان و دنیای واقیعی...

-٨-

هەڵبەتە رۆمان و رەوتی رۆمان بە شێوەیەکی یەکهاوی و یەکدەست نـاڕوات، بەڵکو نەقلە و گوێزانەوەی زۆری تێدەکەوێت. کە ئەم نەقلە و گوێزانەوەیە، رۆتینیەتی خوێندنەوە لەلای خوێنەر دەرەوێنێتەوە. نەقلە بریتییە لە هەر گۆڕان و دۆخەگۆڕکێیەک کە بەسەر هەر یەکێک لە سێکوچکەی رۆماندا دێت. واتە شوێن، کات، و ئاستی واقیع.. بۆیە دەشێت نەقلەو گوێزانەوەکانی، زەمانی، واقیعی بێت، بە گوێرەی ئەو دۆخە گۆڕکێیەی بەسەر هەر یەکێک لە سێ رەگەزی ناڤبریدا دێت... زۆرجار لە رۆمانێکدا، بە تایبەتی لە رۆمانی سەدەی بیستەمدا چەند گوتیارێک دەبینرێت، هەندێجار چەند گوتیارێکی- قارەمان دەبینرێت، هەندێجاری تر گوتیارێکی هەمووشتزان و چەند گوتیارێکی قارەمان دەبینرێت وەکو ئەمە بە روونی لە یۆلیسیسی جیمس جۆیسدا دەبینرێت.. زۆرجار دەبینین راناوی دەستووری لە سێیەم کەسەوە (ئەو، ئەوان) دەگوازرێتەوە بۆ یەکەم کەس (من، ئێمە) بە هەرحاڵ ئەم نەقلە و گوێزانەوانە لە هەندێ رۆماندا زۆرەو لە هەندێکی تردا کەمترە. دیارە سوود یان زیانی ئەم نەقلانە بەندە بە ئەنجامی خودی نەقلەکانەوە، چەند ئاستی واقیعییەت و قەناعەتبەخشی چیرۆکەکە بەرزدەکاتەوەو چەند دەیشێوێنێت. بۆیە ئەگەر نەقلەکان کاراو کاریگەر و بەجێ و گونجاو نەبن و خزمەتی لایەنی قەناعەتبەخشی چیرۆکەکە نەکەن، ئەوا خوێنەر دەپەشۆکێ و لە نێو ئەم نەقلە کوت پڕو لە ناکاو و دەستکردانەدا گومڕا دەبێت. نەقلەی زەمانییش پەیوەندی بە دۆخە گۆڕکێی زەمەنەکانەوە(رابردوو، ئێستا، ئایندەوە) هەیە. سەبارەت بە نەقلەی ئاستی واقیعیش، چونکە ئاستی هەمەجۆر و زۆر هەیە، بۆیە لەو بوارەشدا ئەگەری نەقلە، یەجگار زۆرەو هەموو نووسەرێک پەنای

بۆ بردووە، دیارە چۆنییەتی بەکارهێنانی نەقلە، چ نەقڵەی کوتوپڕ و چ نەقڵەی بەرەبەرە و سوودوەرگرتن لەو وەسیلەیە، بە پێی توانا و بەهرەو ئەزموونی هەر نووسەرێک دەگۆڕێت. هەڵبەتە بۆیە پەنا بۆ ئەو تەکنیکە دەبرێت تا خوێنەر پتر قەناعەت بە کارە ئەدەبییەکە بکات، ئەگەر گوتیار بە شێوازی تایبەتی و دیاریکراوی خۆی و لە چوارچێوەی چیرۆکێکی تایبەتی و دیاریکراودا، ئەو نیشانەیەی پێکا، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی سەرکەوتنە.

بەم پێیە رازو نهێنی و ئەستاتیکا و قەناعەتبەخشی رۆمان لە تەکنیکدایە، و رەگی تەکنیکش دەچێتەوە سەر سێکوچکەی کات، شوێن و ئاستی واقیع بە گشت ئەو لق و پۆپانەوە کە لێیان دەبێتەوە (ئەو سێکوچکەیە لە هەموو رۆمانێکدا، بە شێوەیەک لە شێوەکان هەیە). هەر وردەکاری و هونەرکاری و ناسککاری و ئارایشت و رتوکارییەکیش دەکرێت، رەگی لە تەکنیکدایە و وەسیلەیەکە بۆ ئەوەی خوێنەر قەناعەت بە واقیعییەتی چیرۆکەکە بکات. هەڵبەتە لە چوارچێوەو ئاستی واقیعی رۆمانەکەدا نەک لە چوارچێوەی ئەو واقیعە واقیعییەی کە خوێنەر تیایدا دەژی... یەکێک لەو تەکنیک و وردەکارییانەی کە لە کۆنەوە لە کاری چیرۆکڤانی و حیکایەتەوانی و گێڕانەوەکاریدا بەکارهێنراوە، تا رۆژگـاری ئەمرۆش بە شێوازی جۆراوجۆر بەکاردەبرێت، ئەوەیە کە چیرۆکێک وردە چیرۆکانی لێدەبێتەوە، وەک ئەوەی چیرۆکە ئەسڵییەکە، چیرۆکە دایکەکە، زاوزێ بکات و منداڵ و بێچووی ببێت و زوریەت بخاتەوە. جا ئەم هونەرکارییە وەختێ کاراو کاریگەر و قەناعەتبەخش دەبێت کە جۆرێک لە ئەفسوون، مەندی و گۆنگی و ئاڵۆزی، بە نێوەرۆک و تیمەی چیرۆکە خەیاڵکردەکە ببەخشێت و ئاوێتەی رەگەزەکانی دیکەی چیرۆک ببێت و جۆرە کەماڵێکی هونەری بەکارە ئەدەبییەکە، واتە رۆمانەکە ببەخشێت. حیکایەتی هەزارو یەک شەوە نموونەیەکی زۆر روونی ئەو زاوزێ چیرۆکڤانییەیە کە باسمان کرد، دایکە چیرۆکەکە، دەیان وردە چیرۆکی لێدەکەوێتەوە.. لەم کارە ئەدەبییەدا، شەهرەزاد بۆ ئەوەی لە کوشتن بخەلەسێت و بە مەرەدی ژنەکانی دیکەی شەهرەیاری ترسناک نەچێت، زنجیرەیەک چیرۆکی بۆ دەگێڕێتەوەو هەموو شەوێک چیرۆکەکە لە شوێنێکی فرە هەستیارو بە شێوەیەکی ئەوتۆ دەبڕێت کە شەهرەیار ئەفسوون بکات و خولیای زانینی ئاکامی چیرۆکەکەی بکەوێتە سەر و چاوەڕوانی سبەی شەو بکات، شەهرەزاد بەم شێوەیە شەوێکی تر دەداتە دەم مان و ژیانی خۆیەوە.. ئیدی بەمجۆرە هەزار و یەک شەو بەسەر دەبات. ئەم گوتیارە بەهرەمەندە، بە جۆرێ شەهرەیار ئالودەو ئەفسوونی ئەو

دنیا خەیاڵکردە دەکات کە لە گیانی خۆش دەبێت و ژیانی خۆی دەکرێتەوە.. هەڵبەتە ئەم تەکنیکە بریتییە لەوەی کە لە ڕێگەی گوتیارەوە، چیرۆک لە چیرۆک دەبێتەوە، چیرۆک بە چیرۆک دەسپێردرێت و هەر چیرۆکە، بە چیرۆکێکی دی ئاوسە و وەکو دەنکی تەزبێح بە دووی یەکدا دێن، ئەم پرۆسەیەش لە چوارچێوەی سێکوچکەی نەقلەی زەمانی و مەکانی و ئاستی واقیعدا دەمەێت و هونەریەتی خۆی وەردەگرێت... بەم پێودانگە دەتوانرێت بگوترێت خەیاڵ بۆ دەوڵەمەندکردنی ژیان یەجگار پێویستە و هەرچەندە خەیاڵ ئەو ژیانە نییە کە تیایدا دەژین، بەڵکو ژیانێکی دیکەیە، ژیانێکی یاخییە لە ژیانی واقیعی، بەڵام کەرەستە خاوەکانی لە ژیانەوەو لە وردە ئەزموونەکانی ژیانەوە هەڵدەهێنجێت و لە بۆتەی هونەردا قاڵی دەکاتەوە و ژیانێکی پێدەبەخشێت کە زۆر لە ژیانی ڕاستەقینە باڵاتر و لەبەردڵانترە...

بەهەرحاڵ لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە دووپات بکرێتەوە، کە رۆمان یەکەیەکی یەکپارچەی هونەرییە و بە تێکڕای رەگەزو توخمەکانییەوە ئەدەبییەت پەیدا دەکات بە هۆی تێکڕژان و کارلێکی گشت رەگەزو توخم و پاژو وردە پاژەکانییەوە، گشتێک دروست دەبێت کە لەوە دەردەچێت کۆمەڵێک کەرەستەی خاو بێت و بە زەقی درابنە دەم یەکترەوەو جارێکی دیکە بە ئاسانی لێکدی هەڵاوێردرێن. واتە ئەنجامی کارلێکی رەگەزەکان، یەکەیەکیان لێدروست دەبێت، زۆر زیاترە لە یەکانگیری پاژەکان.. رۆماننووسی چاکیش سەرپشکە لەوەی پەنا وەبەر هەر وەسیلەیەک بەرێت بۆ ئەوەی ئێمەی خوێنەر ئەفسوونی چیرۆکە خەیاڵییەکەی بکات و قەناعەتی پێبکەین.. جا بەو حەساوەی کە تەکنیک و فۆرم و گوتار و دەق، یەکەیەکی یەکپارچە و گشتێکی هونەرییەو لێکدی جیا نابێتەوەو جیا ناکرێتەوە، بۆیە جیاکردنەوەی بابەت، یان شێواز، یان رەوت و نەسەق، یان گۆشەنیگا و روانگە و جیهانبینی، وەکو ئەوەیە بێی بوونەوەرێکی زندوو مۆمیا بکەیت، کە ئەنجامی ئەم کارە لە باشترین حاڵەتیدا، دەکاتە جۆرە کوشتنێک، چونکە ئەو مۆمیایە هەرگیز زندوویەتی و چەلەنگی و گەشی و پرشنگداری و تەڕی و تازەیی بوونەوەر و گووراوە زندووکەی نابێت.. هەڵبەتە ئەم قسەو بۆچوونە بەو مانایە نییە کە رێگە لە رەخنە بگیرێت، یان رەخنە بەکارێکی بێهوودە لە قەڵەم بدرێت و بە پێویست نەزانرێت، بشێت دەستبەرداری ببی... نا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەشێت رەخنە ببێت بە رێنمایەکی یەجگار گرینگ بۆ چوونە ناو دنیای شێوازو نووسینی نووسەرەوە. بگرە هەندێجار دەشێت باس و لێکۆڵینەوەی رەخنەیی بۆ خۆی و لە خۆیدا، کارێکی

فلیڤانی(ابداعی) گەورە بێت، وەکو هەر رۆمانێکی مەزن یان چامەیەکی ناوازە.. بەڵام وێڕای ئەمەش دەبێت ئەوەمان لەلا عەیان بێت کە رەخنە، چەندیش وردو دروست و لۆجیکی و بەجێ بێت، هەر ناتوانێت بگاتە بنج و بناوان و ونگە و حەشارگە و نهێنگەکانی دیاردەی ئەفراندنەوانی و داهێنان و راڤەکردن و شرۆڤەکردنی هەموو ورد و درشتێکی.. چونکە هەمیشە لە رۆمان و چامەی سەرکەوتوودا، رەگەزێک، لایەنێک، رەهەندێک هەیە کە دەستی شیکردنەوەی رەخنەیی ئەقڵانی نایگاتێ، چونکە رەخنە خۆی لە خۆیدا مەیدانی مەشقی ئاوەزو زیرەکییە، بەڵام لە کاری ئەفراندنی ئەدەبیدا، جگە لە ئەقڵ و زیرەکی، مەزەندە، هەستیاری، هەست و نەست، سۆزو گوداز و تەنانەت رێکەوتیشی تێدایە کە ئەمانە لە وردترین تۆڕی باس و لێکۆڵینەوەی رەخنەیی دەرباز دەبن. بۆیە کەس ناتوانێ کەس فێری داهێنان و ئەفراندن بکات.. ئەوپەڕی دەکرێت فێری خوێندنەوەو نووسین بکرێت. ئەویتری وەستاوەتە سەر خۆت و مرۆڤ خۆی، خۆی فێردەکات، ئەمەش رێگەیەکی دژواری پڕ هەوراز و نشێوە، پڕە لە کەوتن و هەستانەوەی بێوچان و بەردەوام... بۆیە باشترین فێرگە، سەبارەت بە رۆمان و بونیاد و فۆرمی رۆمانەوانی، ئەوەیە یەکسەر دەست بە نووسینی رۆمان بکەیت و هەر نووسەرەش بە پێی دەوڵەمەندی و هەژاری ئەزموونی خۆی ، یاساو رێسای رۆمانەوانی تایبەت بە خۆی بەرهەم دێنێت...

**بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:**

- ماریو بارغاس، رسائل الى روائی شاب، ترجمة: صالح علمانی، دارالمدی للثقافة والنشر، ٢٠١٠.
- متعة الروایة، دراسة نقدیة منوعة، دار المعرفة، بیروت، ط ١، ٢٠٠٥، الدکتور احمد زیاد محبك.
- د.صلاح فضل، اسالیب السرد فی الروایة العربیة، ط ١، ٢٠٠٣، دار المدی للثقافة والنشر.
- جابر عصفور، زمن الروایة، ط ١، ١٩٩٩، دار المدی للثقافة والنشر.
- دەربارەی رۆمان و چیرۆک، حەمەکەریم عارف، چ ١، ٢٠٠٨، نووسەرانی کەرکوک.


شاملوو

# شیعر وەک چەک

✍ کامەران جەوهەری (هەڵوەدا)

**"هیچ شتێک، لە هیچ چاخ و زەمەنێکدا، وەکو تەعەهودی رووناکبیران و هونەرمەندانی کۆمەڵگە، بۆ چەوتی و کەموکورتییەکان، گێرەشێوێن و ترسێنەر و ماڵوێرانکەر نییە، چونکە تەعەهود حەزیایەکی پاسەوانی بەنرخترین گەنجی گەردوونە. ئەو گەنجەی کە ناوی ئازادی و مافی ژیانی نەتەوەکانە"[١].**

(ئەحمەد شاملوو)

شیعر سەرەڕای ئەوەی کە تا ئێستاش پێناسێکی دیاریکراوی گشتپەسند و هەمەلایەنی بۆ نەدۆزراوەتەوە، بەڵام بە گوێرەی سەرجەم بۆچوونەکان دیاردەیەکی زێتر خەیاڵی و دوور لە واقیعە. دەربڕینی هەستی دەروونە نەک پاتەکردنەوەی رووداوە بەرچاوەکان. ئەوەی لە ناوئاخنی شیعردا رەنگدەداتەوە، یان دەبێت رەنگبداتەوە، خولیاکانن نەک دەقی هەستە عەقڵانییەکان. ئەو خوێنەرانەش کە دووتوێی دیوانە شیعرەکان دەپشکنن، بەشی هەرە زۆریان تەوژمی خولیایەکی پەنگخواردووی ناخیان دیوانەکانی پێ کردوونەتەوە، نەک ئەو رووداوانەی رۆژانە لەبەر چاویان روو دەدەن. واتە لەم رووەوە شیعر بۆتە ئامرازێکی مۆزیک و شاعیر مۆزیکژەنێکە کە بەپێی ئەو تاسانەی لە ناخیدایە، ئاوازێکی شاد یا خەمگینی لێ پێکدێنێت. خوێنەریش بە هەمان رچەدا و بە پێی

ئەو خولیایانەی دەروونی پەنا بۆ ئەم سازانە دەبا و ئاهەنگی دڵخوازی خۆی لێ دەبیستێ و کوڵی دڵی دادەمرکێنێتەوە. لەم بوارەدا شیعر مەودای خۆخەملاندن و رازاندنەوەی، تا رادەیەک کە لە وزەی شاعیردا بێت، هەیە. لەم بەشەدا رەنگە شاعیر خۆشی سەدلەسەد بەئاگا نەبێت لەوەی کە ئاخۆ دارژاوی قەڵەمەکەی لە سەرچاوەی دڵەوە هەڵهێنجراوە یاخود لە مێشکەوە داچۆڕاوە. چەسپاندنی ئەم خەسڵەتە بە تەواوەتی بۆ هیچکام لەمانە دەست نادا، بۆیە بە ئیلهام دەشوبهێنرێت و وەک ئیلهامێک لێی دەڕوانرێت. واتە چەمکێک کە لە جیهانی سەرەوەڕا و بەدەر لە راستەقینە بەردەستەکانەوە هاتۆتە ماڵی شاعیر.

بە چاوخشاندنێک بەسەر رەوتی چەند هەزار ساڵەی مێژوودا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە رووداوەکان و دۆخە تایبەتییەکانی کۆمەڵگە دەچنە چوارچێوەیەکی زەمەنیی تایبەتەوە و بەو گۆڕانانەی رەوتی مێژوو دەپێکن چۆنییەتی کۆمەڵگە و رووداوەکانی ناو کۆمەڵگە دەبنە ئامانج و گۆڕانیان بەسەردا دێت. بۆیە ئەگەر نووسراوەیەک، تەنانەت بەدەر لە شیعریش، بۆ رووداوێک، دۆخێک یان قۆناغێکی تایبەتی مێژوو نووسرابێت لەگەڵ بەسەرچوونی ئەو قۆناغەی دۆخەکەی لەخۆ گرتووە و چۆتە ناو بیرەوەریی مێژووەوە، ئەو نووسراوانەش دەبنە بیرەوەریی و لە کولێتی مێژوودا هەڵدەپەساردرێن. واتە تەمەنیان بەقەد تەمەنی ئەو دۆخەیە کە بۆتە مامانی ئەو نووسراوانە. بێگومان ئەو نووسراوانەی سەر بە زەمەنێکی تایبەتن سەرجەمیان بایەگانی ناکرێن و لە یاد ناچنەوە. ئەوانەی راپۆرت لە دەورانەکان دەکەن بۆ داهاتووان وەک رووناککەرەوەی کووچە و کۆڵانەکانی مێژوو وان، بەڵام ئەوی لێرەدا مەبەستە شیعرە، بە هەموو خەسڵەتە شیعرییەکانیەوە و تیشکخستنە سەر ئەو شیعرانەی بۆ زەمەنێکی دیاریکراو دەنووسرێن.

ئەو چەمکە پیرۆز و موقەددەسانەی دێنە ناو شیعری راستەقینەوە و گوزارشت لە رووە جوانەکانی مرۆڤ و بەهاکانی جیهان بە بێ هەڵاواردن و بە سەرجەمی دەکەن، تۆزی زەمەنیان لەسەر نانیشێت و تەمەنیان شانبەشانی مێژوو هەڵدەکشێت. بۆ نموونە زۆربەی شیعرەکانی "حافزی شیرازی" کە رەنگی زەمەن و مۆرکی کۆمەڵێکی تایبەتیان لێ نەدراوە و رۆحی هەموو مرۆڤەکان و گەردوونەکان دەگرێتەوە و بە باڵسووکی سنووورە کێشراوەکان دەبڕێت، زۆر ئەستەمە گەردی زەمەنی لەسەر بنیشێت و لەسەر تاقچەکەی کوختی مێژوو لەبیربچێتەوە. بەستنەوەی شیعر بە رووداوە سنووردار و واقیعییەکانەوە، غەدرێکە کە لە شیعری راستەقینە دەکرێت. واتە لەو کاتانەدا کە ئەو هەست و

نەستەی شاعیر دەکرێت بۆ خولْقاندنی شیعرێکی ئازاد و بێئاڵقە و مۆرک کەڵکی لێ وەرگیرێت، دەکرێتە دەستەچیلەی ئاورگی شیعرێکی کەمتەمەن. شیعرێک کە لەگەڵ بەسەرچوونی رووداوەکان بەسەر دەچێت و تاقە بەختی بۆ هاتنەوە بەرچاو و سەرلەنوێ گەشانەوە، دووپاتەبوونەوەی مێژووە و دەرکەوتنەوە و رووداونەوەی هەمان دۆخ کە بەرهەمهێنی ئەو شیعرە بووە. ئەوەش ئەگەر نەڵێین ئەستەمە، زۆر دەگمەنە.

بەڵام شاعیرە راستەقینەکان، لە وەها دۆخێکدا، چۆنە شیعر قوربانی دەکەن؟

"شیعری ئەو رۆژگارانە ئەبوو مەشخەڵ و سروود و هەڵمەت بێت و بە قورگی داستان هاوار بکات". (شێرکۆ بێکەس)

هەست بە بەرپرسارێتیکردنی شاعیران لە هەمبەر ئەو رووداوە تاڵ و شیرینانەی کۆمەڵگەکەیان دەگرێتەوە، هۆی سەرەکی لەدایکبوونی شیعرە سنووردارەکانە. شاعیرانی مەزنی کورد شیعرییەتی شیعریان - بەدەر لە پێوانی نرخەکەی - قوربانی ئەو قۆناغانەی مێژوو کردووە کە گەلەکەیانی تێدا چەوساوەتەوە، یا کلاورۆژنەیەک بەدیکراوە، کە بۆی هەبووە لێیەوە بە تیشکی زێڕینی شیعر مێشک و بیروباوەڕی خەڵک روونکرێتەوە. دابەزاندنی پلەی شیعر لە وەها قۆناغێکدا و قوربانیکردنی شیعرییەتی شیعر، واتە قوربانیبوونی خودی شاعیر. شاعیر دەبێتە کەسێکی مەیلەو یاخیی خۆکوژ، کە هەوسار لەو هەست و نەستانە دەدا وا شیعری بێ سنووریان لێ هەڵدەقوڵێ و دەیانگێڕێتەوە ناو جوغزی سنووری کۆمەڵگەکەی. شاعیری کورد، تەنانەت خەون و خولیاکانیشی، کە رەنگە هەوێنی بەدیهێنی زۆر شیعری ئازاد بن، کورت دەکاتەوە سەر ئەو خولیایانەی تەمەنی گەلەکەی تێدا درێژ کاتەوە.



واتە شاعیری کورد شیعر دەکاتە چەک و بەو چەکەی رووی دزێوی مێژوو دەپێکێ و بەری شیرینی لێ دەخوازێت، بەڵام ئەگەر وردبینەوە، مخابن، لەباری شیعرییەوە شاعیر بە هەمان چەک رۆحی شاعیریەتی خۆشی دەپێکێت و ئەوەش خەفەتباترین و گەورەترین قوربانیدانە بۆ نیشتمان و مەزنترین پێشکەشە کە بە کۆمەڵگە دەدرێت.

ـ جاری وایە شاعیر بە ئاگادارییەوە شیعرەکەی دەکاتە چەکێک بەرامبەر ئەو رەوتەی دەسەڵات یا کۆمەڵگەی پێ بەرێوە دەبرێت. جا چ رەوتەکە وەک لایەنێکی رۆحی دیاربێت و چ وەک رەوتێکی لەبەرچاو و بەرهەست. ئەو کاتەی شاعیر بە ئاگاییەوە دەست دەداتە وەها کارێک بێگومان هەوێنی زۆربەی شیعرەکانی لە کۆمەڵگە و دەسەڵات و ئەو رەوتە وەردەگرێت کە ژیانی تێدا بۆتە قوربانی و گەلی تێدا بۆتە دەستەچیلە. لەم حالەتەدا شاعیر لە مێژوونووس نزیک دەبێتەوە. واتە لکی داری مێژوو لە پەلکی گوڵی شیعر موتوربە دەکا و کووژەکەی رەوتی مێژوو بە تاڵە دەزووی شیعر دەهۆنێتەوە. خوێنەری سبەینێی ئەم شیعرانە، بەر لەوەی روانگەیەکی رەهایان بۆ دامرکانەوەی تاسەکانی خۆی تێدا بدۆزێتەوە، لادیواری سینەمایەکی لەبەر چاو هەڵدەچنرێت و ریزە فیلمێکی لەسەر نیشان دەدرێت. ئەو شاعیرانەی لەسەر ئەم رێبازەن بێت و وریا نەبن مێژووی دڵرەق وەک ئامرازێک کەڵکیان لێ وەردەگرێت و هیچ دوور نییە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا شیعرەکانیان بچێتە خانەی فەرامۆشییەوە. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە لە شیعردا مەودای خەریکبوون بە سەرجەم لایەنەکانی کۆمەڵگەوە نارەخسێت و لە هەردی شیعردا ئەو ئاماژەیەی بە مێژوو دەکرێت، ئاماژەیەکی گشتییە، بەڵام لە لای مێژوونووس مەودای وردبوونەوە لە گشت ئاکار و کردەوە و کەلێن و قوژبنەکانی ئەم ماوە زەمەنییە و رووخسەتی تۆمارکردنیان بە درێژیی دەست دەدات. کەواتە شاعیری ناوریا و نازیرەک هەردوو لایەنەکەی دۆڕاندووە، باڵی شاعیرییەتی بەهۆی قورسایی باسی مێژوویی لەنگ بووە و باری مێژووییشی، بەهۆی نەگونجاوبوونی ئەو دەفرەی بۆ باسەکەی تەرخانکردووە، واتە دەفری شیعر، پەک خستووە، چونکە ئەرکی مێژوونووس وێنە هەڵگرتن و کۆپیکردنە و کاری شاعیر ئەفراندن و داهێنان. ئیدی ئەوەی لە کۆمەڵگایەکیماڵوێرانی وەک کۆمەڵگای کوردەواریدا، بەهۆی زەبر و زەنگی دەسەڵاتە دەرەکییە داگیرکەرەکان و کەمتەرخەمیی ناوەکییەکان، هەلی خوڵقانی پەراوێکی مێژوویی پوخت بۆ کورد و زمانی کوردی نەرەخساوە، ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی هەموو شاعیرەکان وەک مێژوونووس سەیر بکرێن و بە سەد ئەڵڵا و وەڵڵا هەوڵ بدرێت لە ئەستێری

دیوانەکانیاندا شەربەیەک ئاوی مێژوو هەڵبهێنجرێت، شتێکی بە تەواوی جیاوازە.

- خۆ ئەو شاعیرەی کە لە بێ ئاگاییشدا دەنووسێت دواتر، بە پێداچوونەوەی ورد بە شیعرەکانیدا، دەکرێت ڕوویەکی شاراوەی مێژووی تێدا بدۆزرێتەوە. واتە ئیلهامەکانی بۆ ناخی کۆمەڵگە و قووڵایی مێژوو ڕەگاژۆیان کردبێت. وەک مامۆستا هەژار دەفەرموێت: "وێژەناسان لایان وایە هەر بوێژێک، لە هەر دەور و زەمانێکا، هەر ڕێبازێکی گرتبێ یان بەبێ ڕێ ڕۆیشتبێ، بەهەر ئاوات و نیازێک هەڵبەستی هۆنیبێتەوە، ئەو بوێژە لە ماوەی ژیانی خۆیدا ڕمووزێکی درۆزن یان خووخۆش و ڕاستگۆ بێت، سفت بێت یان بێ تانوپۆ بێت، بەلەنگاز یان ساز و کۆک بێت، بوێر بێت یان ترسنۆک بێت، بێ ئەوە خۆی ئاگا بکا، بێگومان هەڵبەستەکانی ئاوێنەیەکی ڕوونوێنی ڕوودانی ژین و کردەوەی ئاپۆرەی ڕۆژگاری چەرخی خۆیەتی"[٢].

لەم بێئاگاییانەدا باسە مێژووییەکان لە دەرکەی بیری خوێنەر نادەن و هەر خۆبەخۆ دەدەڵێنە ناخی خوێنەرەوە، وەک چۆن بەبێئاگاییش لە جەوهەری پێنووسی نووسەرەوە داچۆڕاون. واتە چەکێک نەبووە بە دەست شاعیرەوە، بەڵکو گۆڕەپانێک بووە کە شاعیر و گشت کۆمەڵگەی شاعیر هاموشۆیان تێدا کردووە، بەڵام خوێنەری ئەو بابەتە تێکەڵاو بە مێژوویانەی بە ئاگاییەوە نووسراون، خۆی بە ئاشکرا دەچێتە ناو ئەو خانووچکەیەی شاعیر دایڕشتووە.

خوێنەری ئاسایی بەشی یەکەمینیان، ڕەنگە قەت هەست بەو شیلە مێژووییە نەکات کە لە دەماری شیعرەکاندا دێت و دەچێت. ئەوە ئەرکی لێکۆڵەران و توێژەرانە کە ئەم لەشە شیعرییانە جەراحی بکەن و ئەو شیلەیە دەرخەن. مخابن، لەوەها کاتێکیشدا تامی شیعری لە کیس دەچێت و دەبێتە ڕاپۆرتێکی بێ تام و بۆ، چونکە لە ڕاستیدا شیعر بەرگەی جەراحی ناگرێت و زوو سارد دەبێتەوە. شیعری ڕاستەقینە خوناوی بەرەبەیانی سەر پەلکی گوڵێکە و سیحری جوانییەکەی بە دەستتێوەردان و ترازان و ڕژانە سەر عەرز شرت و گوم دەبێت.

ڕەنگە لە شاعیرانی هاوچەرخی کوردەواریدا کەس بەقەد "مامۆستا هەژار" و "عەبدوڵڵا پەشێو" ئاوا بە زەقی قامکی لەسەر پەڵەپیتکەی چەکی شیعر نەترازابێت. بە چاوخشاندنێک بەسەر کۆی بەرهەمە شیعرییەکانی ئەو شاعیرانەدا باش دەردەکەوێت کە بێدەسەڵات بوون لە بواری شاعیرێتیدا وای نەکردووە ئەم لاڕێبازە هەڵبژێرن، چونکە لێرەولەوێی دیوانەکانیاندا شاکارە شیعری وا خۆ دەنوێنێت کە بۆ دەسەڵات و نەمرییان بەڵگەیەکی سەلمێنەرە، بەڵام ئەوە ژانی هەستکردن بە لاڕێداچوونی مێژووی گەلەکەیانە کە لێیان بۆتە بەرەژانی

شیعر و وازی پێ لە چوونە ناخی خۆوە و خەریکبوون بە رۆحی خۆ هێناون و فڕێی داونەتە ناو گێژاوی ئەو ژاوەژاوەی کۆمەڵگەی پێدەچەوسێنرێتەوە. وەک "شێرکۆ بێکەس" بۆ ئەم قۆناغانە ئاماژە دەکات و دەڵێت: "دەنگە هێور و نزمەکان، خەم و مەراقی تاکەکەسی، بەناچاری کپ دەبن و ئیتر هاوار و خەمی گەورەتر لە خۆت، بە دەنگی بەرز و مانای زەقەوە دێتە پێشێ. ئێمە سەرەتای بەهرەمان ڕێکەوتی ناو ئەم زریانانە کرد"[٣].


هێمن

بڵێسەیەک کە لە ویــژدان و دەروونـــی ئــەم شاعیرانەدا هەڵگیرساوە، پێش هەموو شت ئــاقــاری خولیا تایبەتییەکانی خۆیانی پێ هەڵپڕووزاوە و بەر پێی ڕێبوارانی کۆڵانە نووتەکەکانی مێژووی پێ ڕوونکراوەتەوە.

"مام هێمن" دەفەرموێت:

**"خۆم دەسووتێنم هەتا بەزمی خەڵک ڕۆشن بکەم**
**کێ لە ڕێی گەلدا وەکوو شاعیر دەسووتێ شەم نەبێ".**

هەژار و پەشێو، وەک نموونە، لە نەبوونی ئەو ویژدانە وریایانەدا کە لە ڕێگای جیاواز لە شیعرەوە دەیانتوانی قامک لە چاوی بەرپرسیارانی نەهامەتییەکانی کۆمەڵگا و بەتایبەت دەسەڵاتە دەرەکی و ناوەکییەکان ڕاکەن، ناچاربوون خۆیان فیداکەن و هەستی شاعیرانەی خۆیان لەو پێناوەدا هەم بکەنە چەک و هەمیش بکەنە قوربانی. ئەو دۆخەی لە لای شاعیران و نووسەرانیتر قەڵەمیان پێ لە گیرفان دەخاتەوە و بێدەنگییان پێ جاڕ دەدا لە لای شاعیرانی وریا هەرنەبێت دەبێتە هەوێنی بەگژاچوونی خودی دۆخەکە. ئەوەی لە شێوازی نووسینی ئەم دوو شاعیرەدا تا ڕادەیەک وای کردووە بەرهەمە لە مێژوو نزیکەکانیشیان ڕەنگ و بۆی شیعریان لێ دانەماڵدرابێت و تەمەن کورتی بە ئاشکرایی پێیان نەوێرێت ڕایەڵێکی شاعیرانەیە کە پۆی ئەم باسانەی تێهەڵکێشراوە. واتە لەزەتێکی شیعری کە لەگەڵ نواندنی کردەوە ڕاست و چەوتەکانی کۆمەڵگە و دەسەڵات دەرژێتە دەروونی خوێنەرەوە. هەڵبەت ئەوە بەو مانایە نییە کە نرخی شیعرەکانی هەژار

و پەشێو لە یەک ئاستدان[٤].

بەشێکی زۆری ناوئاخنی دیوانی ئەم شاعیرانە بە وەها چەکێک رەنگاوە. ئاماژەکردن بە نموونەی شیعری تەنیا وتارەکە درێژ دەکاتەوە، بۆیە خۆی لێ دەبوێرم و تەنیا وتەیەکی "عەبدوڵڵا پەشێو" وەک کۆتایی دێنمەوە: "فۆرمی شیعر وەکو باڵی مێشێ تەنکە، قورقوشمی مەوزووعی کۆمەڵایەتی و شتی وا زۆر تەحەممول ناکا. من ئەو شتە دەزانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی لێدەدەم... ئەگەر رۆژێک لە رۆژان باری ژیانی نەتەوەکەم گۆڕا و ئەو شتانە بوون بە مێژوو، یاخوا سەد جار ئەو شیعرانە دەمردن، بلا بمرن...»[٥].

**ژێدەرەکان:**

١- کتاب جمعه ـ شماره ٦ ـ شهریور ١٣٥٨.

٢- پێشەکی چاپی سێهەمینی دیوانی "بۆ کوردستان"، هەژار.

٣- لەگوڵەوە هەتا سووتوو، وتووێژ لەگەڵ گۆڤاری کاروان.

٤- پەشێو و هەژار سەر بە دوو شێوازە شیعری جیاوازن، نیشانگەی چەکەکانیشیان جیاوازی تێدا دەبینرێ، بەڵام ئەو خولیایەی لە پێست و هێسقانیان کاریکردووە یەکڕەنگ و یەکبۆیە.

٥- وتووێژی پەشێو لەگەڵ mcd.tv

# بیر لە فڕین بکەرەوە هاوڕێ، ئەوەتا باڵت لێدەڕوێ!

## گەشتێکی کورت بەناو ئەدەبیاتی فڕیندا



کامیل محەمەد قەرەداغی

ئەگەرچی فڕین بە ئاسماندا خەونێکی دێرینی مرۆڤە، بەڵام پێکهاتەی لەشی وایە کە توانای فڕینی نەبێت، رەنگە قورسیی لەش و پێکهاتەی ئێسکەکانی رێگربن لەوەی بتوانێت راستەوخۆ وەک باڵندە و بەبێ پەنابردن بۆ هیچ ئامرازێکی دەرەکی ئەو خەونەی بهێنێتەدی. دیارە ئەم خەونە ئەوەندە مرۆڤی سەرقاڵ کردووە ئێستا کەرەستەکانی جێگرەوەی فڕین زۆر و زەبەند بوون و کەوتوونەتە بەردەست، مێژووی فڕین و کەوتنەئاسمان بەروارێکی درێژی هەیە، ئەگەرچی ئەو بەروارەش بێبەری نییە لە کارەسات و رووداوی ناخۆش. قۆناغە سەرەتاییەکانی ئەزموونکردنی فڕین تا گەیشتن بە داهێنانی فڕۆکە و مووشەک و میسباری گەیاندنی مرۆڤ بە مانگ و ئەستێرەکانی تر قوربانیدان و زیانی زۆری ویستووە.

حەزدەکەم دوو رووداو لەبارەی زیانەکانەوە باس بکەم: ئەو دەمەی زانا رووسەکان دەیانەوێ توانای فڕینی گەورە و درێژخایەنی دەرچوون لە گۆی زەوی تاقی بکەنەوە، کەسێکیان دەوێت لەگەڵ مانگی دەستکردی (سپوتنیک)دا سەربکەوێت و خولگەی زەوی بەجێبهێڵێت، دوا بڕیاریان لەسەر ئەوە جێگیر دەبێ کە لەبری ئەو کەسە سەگێک رەوانە بکەن، ئەو سەگەی کە هەڵیدەبژێرن و مەشقەکانی پێ تەواو دەکەن، ناوی (لایکا)یە، لایکا و سپوتنیک پێکەوە دەفڕێنن،

بەڵام بەداخەوە هیچیان ناگەڕێنەوە.

چیرۆکی دووەمیان سەربردەکەی (عەباسی کوڕی فەرناسی کوڕی وەرداس)ە، کە خەڵکی ناوچەی تاکرتای قورتوبە بووە لە ساڵی (٨٨٤ز)دا مردووە. ئەم کابرایە شارەزایەکی بواری زانستەکان بووە و چەند داهێنانێکیشی کردووە، لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا بیر لەوە دەکاتەوە، کە ئەگەر وەک باڵندە باڵ بۆ خۆی دروست بکات لەوانەیە بتوانێت بفڕێت، بۆیە لە پەڕی چەندان باڵندە دوو باڵی باش بۆ خۆی دروست دەکات و لە بەرزاییەکی زۆرەوە (لەسەر منارەی مزگەوتی قورتوبەوە)دەدات لە شەقەی باڵ و بەبێ ئەوەی باڵەکانی بتوانن هیچ فریاگوزارییەکی پێشکەش بکەن، بەردەبێتەوە و بەو بەربوونەوەیەش زیانی جەستەیی زۆری لێدەکەوێت، هەندێک لە مێژوونووسان دەڵێن پشتی شکاوە و هەندێکیش دەڵێن پەراسووەکانی شکاون، بەڵام هەرکوێیەکی شکابێت، لەو نەخۆشکەوتنەی هەڵنەساوەتەوە و مردووە. هەندێک زانای عەرەب دەڵێن ئەگەر وەک ئەوەی باڵی دروست کرد، کلکیشی دروست بکردبا، لەوانەبوو فڕینەکەی سەربکەوتایە. ئەم هەوڵەی عەباس وایکردووە لە زۆربەی پایتەختی وڵاتە عەرەبییەکاندا، بە بەغدادیشەوە پەیکەری بۆ دروست بکرێت، بەڵام بیریاری ناسراوی عیراقی (فالح عەبدولجەبار) لە کۆڕێکیدا، کە لەم ساڵانەی دواییدا لە زانکۆی سلێمانی بۆی ڕێکخرا، لە باسی ڕەخنەگرتن لە عەقڵی عەرەبیدا باسی ئەم هەوڵی فڕینەی عەباسی کرد و وتی بەداخەوە عەقڵی عەرەبی توانای ئەوەی نییە شتەکان وەک خۆیان تێ بگات، ئەوان ناتوانن لە هەڵەکانی مێژووش تێبگەن، بۆ نموونە ئەو کارەی کە کوڕی فرناس کردوویەتی مایەی شانازیی پێوەکردن نییە، بەڵکو شەرمەزاریشە، چونکە مرۆڤ توانای فڕینی نییە و ئەو ویستوویەی بیفڕێنێت، کەچی ئێستاش هەر پەیکەری بۆ دروست دەکەن.

فڕین حەزێکە و حەزێکی خۆشیشە، ڕەنگە بەشێکی ئەم حەزەی مرۆڤی نەفڕیو لاساییکردنەوەی ئەوە بێت، کە دەبینێت باڵدارەکان زۆربەیان کەم تازۆر دەفڕن، یان لەوەوە هاتبێت کە حەزی کردووە پانتایی و کایەی بینینی خۆی فراوانتر بکات و بتوانێت بەرزببێتەوە، بۆئەوەی بزانێت لەدەرەوەی ئەو سنوورەی کە خۆی تێیدا دەژی چی تر هەیە.

بۆ بەدیهێنانی ئەم حەزەی مرۆڤ مێژوو لە سەردەمی دێرینەوە بۆ ئێستە چەندان هەوڵی بەخۆیەوە بینیوە، ((لە ساڵی (٤٠٠)ی پێش زایندا زانایەکی یۆنانی، کە ناوی (ئارچیتاس)ە کۆترێکی لە تەختە دروست کردووە و توانیویەتی بیفڕێنێت، بەڵام ئێستاش ئەوە ڕوون نەبووەتەوە، ئایا ئەو وزەیەی کە کە پێی

فڕاندووە چی بووە، ئایا تەنها بزواندنی میکانیکی بووە، یان سەرچاوەیەکی تری وەک پاڵنانی هەڵمیی بەکارهێناوە! لە ساڵی (٣٠٠) پێش زایندا چینییەکان جۆرێک کۆلارەیان پەرەپێداوە و گەورەیان کردووە تا ئەو رادەیەی توانیویانە یەک نەفەری پێ ببەنە ئاسمان. لە سەدەی سێیەمی پێش زایندا ئەرخەمیدسی زانای یۆنانی هۆکارەکانی کەوتنە سەر ئاوی دۆزییەوە، لە ساڵی (١٢٩٠)ی زاینیشدا قەشەیەکی ئینگلیزی، کە ناوی (رۆجەر بیکۆن) بە پشتبەستن بەو دۆزینەوەیەی ئەرخەمیدس ئەوەی ئاشکرا کرد، کە لەناو بادا ئەو تەنۆلکانە هەن، کە لە ئاودا هەن و بواری سەرئاوکەوتن دەرەخسێنن، بۆیە ئەگەر مرۆڤ بتوانێت کەرەستەیەکی لەبار دروست بکات، ئەوا چۆن کەشتی و پاپۆڕەکان بەسەر ئاوەوە دەڕۆن ئەوا ئەو کەرەستانەش توانای ئەوەیان دەبێت بەسەر بادا بفڕن. لە ساڵی (١٥٠٠)ی زایندا هونەرمەندی ناسراوی جیهانی (لیۆناردۆ داڤینشی تابلۆی ئۆرنیسۆپتەر) دروست دەکات، کە وێنەیەکی خەملێنراوی خەیاڵیی کەرەستەیەکی فڕاندنی مرۆڤە. لە ساڵی (١٦٨٠)ی زاینی زانای بیرکاری ناسی ئیتاڵی (جیۆڤانی بۆریلی) بەشێوەیەکی زانستیانە سەلماندی کە مرۆڤ ئەگەر کەرەستەی تر بەکار نەهێنێت، هەرگیز توانای ئەوەی نابێت بفڕێت))(*).

هەڵپەکردن سرووشتێکی مرۆڤە و دانیشتنی بێجووڵەش کەڵکی نییە، بۆیە ئەوەی لە واقعدا پێی نەکراوە، هەوڵیداوە لەناو ئەدەبدا جێبەجێی بکات، چونکە ئەدەب وەک ئەوەی ئاوێنەیەکی رەنگدانەوەیە، زەمینەیەکی لەباریشە بۆ دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی گونجاو بۆ شکستەکانی ژیان. ئێمە لەناو ئەدەبدا برینەکانی خۆمان چارەسەردەکەین، ئەو دوژمنانەشمان دەڕووخێنین، کە بە دەست و بە واقع پێمان ناڕووخێنرێن. بۆیە لەناو ئەدەبدا بە ئاسانی جێگەی فڕین دەبێتەوە. ئەفسانەش بە هەمان شێوە. لە ئەفسانەدا دەکرێت هەر شتێکی نائاسایی رووبدات، نموونەیەک دەهێنینەوە (دیدالۆس و ئیکارۆس) کوڕ و باوکێکی یۆنانی بوون زۆر حەزیان لە فڕین بوو، بە پەڕ و مۆم باڵیان بۆ خۆیان دروست کرد و فڕین بە ئاسماندا، هێندە بەرزبوونەوە تا لە خۆر نزیک بوونەوە تا خۆر باڵەکانیانی سووتاند و هەردووکیان کەوتنە دەریاوە نوقم بوون.

لەیادمان نەچێت فڕین یەکێکە لە سیفەت و دەستکەوتە باڵاکان، یەکێکی جوانییەکانی فریشتەکان، کە سیحری خۆیانی پێ دەخەنە سەر مرۆڤ ئەوەیە، کە ئەوان بە ئاسانی دەفڕن.

پێم خۆش بوو لەناو ئەدەبی کوردیدا ئەزموونکردنی فڕینمان بینی، بەختیار عەلی وەک دەستپێشخەرییەکی گەورە لەم بوارەدا جگە لەوەی رۆمانی

(جەمشیدخانی مامم)ی نووسیوە، لە گۆشەکەی خۆیدا لە رۆژنامەی (ئاوێنە) راپۆرتێکی باشی لەبارەی فڕینەکانی ناو ئەدەبەوە نووسیوە، کە ئەمەش دیسان سوودبەخشە، بۆیە دەمەوێ من باس لەوشتانە نەکەم، کە بەختیار تیشکی خستووەتە سەریان و وەک بەشێک لە کەلەپووری گەورەی ئەدەبی مرۆیی ژماردوونی.

"جەمشیدخانی مامم" سەربردەی مرۆڤێکی کوردی ئەم سەردەمەیە، کە کەوتووەتە سەر شەپۆلی هەڵچوون و داچوونە قورسەکان و ئەوەندە کەوتووەتە بەر شەقی زەمانە و پاشووی جووتەی رۆژگار تا لە چرکەساتێکی تەمەنی خۆیدا شەفاف دەبێتەوە و کێش و قوورسایی خۆی لەدەست دەدات و چۆن بەبێ ویست کەوتە زیندان ئاواش بەبێ ویست نەرمەبایەک دەیفڕێنێت و لە زیندانەوە دەیگوێزێتەوە بۆ دونیایەکی تر.

ئەم کاراکتەرە، کە بۆی دەردەکەوێت توانای فڕینی تێدا پەیدا بووە خۆی دەخاتە ناو چەندان ئەزموونەوە، کە ئەگەر هەر وەک کەسێکی ناو زیندانەکە بمایەتەوە هیچیانی پێ نەدەکرا. بۆیە زۆر جار دەدات لە شەقەی باڵ و دەچێتە ئاسمان و لە بەرزییەوە دەڕوانێتە شتەکان.

لەگەڵ فڕین و بەرزبوونەوە گەورەکاندا زۆرجار بەربوونەوەی گەورەش هەیە، هەر بەربوونەوەیەکیش سڕینەوە و پاککردنەوەیەک بۆ زاکیرەی ئەم کاراکتەرە دەکات، لەبەرئەوە زۆرجار هەڵوێست و بیرکردنەوەکانی دەگۆڕێت. کەی ئەم بوونەوەرە لە کەوتنەوە هەستایەوە سەرپێ دەیبینیت مرۆڤێکی ترە، بۆچوونەکانی گۆڕاون. چۆن خۆی دەفڕێت ئاواش بۆچوونەکانی دەگۆڕێن، بۆیە ناتوانێت لەناو هیچ کام لە هێڵە فکری و حزبییەکانی ناو کورددا تامی جێگیربوون بزانێت، چەپڕەوی و راستڕەوی هەمووی تاقی دەکاتەوە و لە هەمووشیدا توندڕەوە و سەرسەختانە کار دەکات.

لە یادەوەریی هەمووماندا بابەتی (کاوە دەفڕێت) ماوە، ئەو بابەتەی، کە لە کتێبی کوردیی پۆلی دووەمی سەرەتاییدا دەمانخوێند، ئەوەش هەر فڕاندنی مرۆڤ بوو، بەڵام بەو شێوەیە نا، کە لە رۆمانی (جەمشیدخان) و بەرهەمە ئەدەبییەکانی تردا دەیبینین، بەڵکو کاراکتەرە سەرەکییەکە لە (کاوە)ی برادەری خۆی دەپرسێت، کە داخۆ دەیەوێت گەشتێک بە ئاسماندا بکات؟ ئەویش دەڵێت بەڵێ، بۆیە کاراکتەرەکە وێنەیەکی کاوە لەسەر کۆلارەکەی خۆی دەکێشێت و هەڵیدەدات بۆ ئاسمان.

لە چیرۆکی (پیرەی باڵدار)دا مارکیز نموونەی خێزانێکمان پێشکەش دەکات،

کە زۆر هەژارن، منداڵیان بووە و داهاتیشیان نییە، بەیانییەک، کە شەپۆلی دەریا نیشتووەتەوە و ئارام بووە، قرژاڵێکی زۆر بەسەر کەنارەکانەوە بەجێماوە و هەرکەسە دەبێت بەردەرگاکەی خۆی پاک بکاتەوە، کابرای خاوەن ماڵ خەریکی دوورخستنەوەی قرژاڵەکانە و ئاگاداری دەکەن، کە پیرەمێردێکی باڵدار لەناو کولانەی مریشکەکانیدایە، پەڕ و باڵی فڕینی هەیە و لەوە دەچێت بە دەم با و باهۆز و باگژەی شەوەوە هاتبێتە ئەوێ. نیشتنەوەی پیرەمێردێکی باڵدار لەناو کولانەیەکی ئەو ماڵەدا وەک هەواڵێکی عەجایەب بە زوویی بڵاودەبێتەوە و لە شوێنانی ترەوە خەڵک دێن بۆ بینینی، ئەمجا دوای چەند رۆژێک پێشنیار بۆ خێزانەکە دەکرێت، کە سەیرکردنی ئەو پیرەمێردە باڵدارە بکرێت بە پارە و هەر کەسێک بیەوێت ببینێت ناچار بکرێت پارەیەک بدات. زۆربونی ژمارەی سەیرکەران داهاتی خێزانەکە باش دەکات و ژیانێک بۆ ساوا تازە لەدایکبووەکە دابین دەبێ. پیرەمێردەکە پەڕە کۆنەکانی هەڵدەوەرێنێت و پەڕی تازەی لێ دەڕوێتەوە، لە رۆژێکی پاش پەڕ دەرهاتنەوەکەیدا دەفڕێت، کولانەکە بەجێدەهێڵێ دەچێتەوە بۆ ئاسمان و جارێکی تر نابینرێتەوە.

(هاشم غەرایبە) نووسەری عەرەبی ئوردونی لەبارەی ئەزموونی کەوتنە زیندانی خۆیەوە رۆمانێکی نووسیوە، بە ناونیشانی (ئەو پشیلەیەی فێری فڕینی کردم) تیایدا باس لەوە دەکات، کە چۆن لە بەندیی پشتی رایەڵ و تەلبەندەکانی زیندانەوە لە پشیلەیەکەوە ئەوە فێر بووە بفڕێت و بەرەو ئازادیی خۆی هەڵبێت.

نووسەری لاتینیی (ئەنریکۆ ئەندرسن ئیمبێرت) چیرۆکێکی زۆر کورتی هەیە بە ناونیشانی (فڕینی پیدرۆ بە ناکۆتادا)، کە چەند جارێکیش کراوە بە کوردی. چیرۆکێکە، سەرباری ئەوەی کورتیشە زۆر پەسەندە. پیدرو پاڵەوانی سەرەکییە، نەخۆشە و لەناو جێگەدا کەوتووە، تای هەیە و دکتۆرەکەشی رۆشتووە و بەجێی هێشتووە، پیدرۆ بە ژنەکەی دەڵێت (لۆقەم دێت، هەستدەکەم رۆحم دەیەوێ جەستەم بەجێبهێڵێت)، ئەمە ئیتر دەرکەوتنی شیانی فڕینی پیدرۆیە، پاش چەند سەعاتێک لە جێهێشتن کە ژنەکە دەگەڕێتەوە لای پیدرۆ، سەیر دەکات لە جێگەکەی خۆیدا نەماوە، بەڵکو وەک ئەوەی هیچ کێش و بارستاییەکی نەمابێت، هەڵکشاوە بەرەو بەرزی و نووساوە بە بنمیچی ژوورەکەوە. دواجار لە هەلێکی تردا پیدرۆش دەفرێندرێ بۆ ئاسمان و ناگەڕێتەوە.

وادەزانم ئەم نەگەڕانەوەیەی پیدرۆ وەلامێکی فەلسەفییانەی بە شێوازی ئەدەبیانە داڕێژراوبێت بەو تێرامانەی، کە فڕین خۆشە، بەلام مرۆڤ ناتوانێت بفڕێت، خۆ ئەگەر فڕی، ئیتر واباشە نەگەڕێتەوە سەر دۆخی ئاسایی جارانی

خۆی، بەمەش دوالیەتی فڕین و نیشتنەوە دروست دەبێ، چونکە وەک گوتمان مرۆڤ لەشی قورسە، وەک ئەوەی بەرزبوونەوەکەی بۆ فڕین ئاسان نییە، ئاواش بەربوونەوەکەی لە ئاسمانەوە و لەپاش فڕینەوە پڕ گرفتە. بیر لە نیشتنەوەی باڵندەیەک بکەرەوە، کە لەپاش فڕینەکەیەوە دەتوانێت چەندجار قاچ بداتەوە لە زەوی و نەنیشێتەوە، سووکیی لەشی یارمەتی ئەوەی دەدات ئەوکارەی بۆ بڕەخسێت، بەڵام مرۆڤێکی قورس ئەگەر فڕینەکەشی بۆ بلوێت، ئەوا نیشتنەوەکەی بۆ دەبێت بە گیروگرفت، کەواتە نیشتنەوەش گرفتێکی ترە و فیزیای خۆی هەیە.

سلێمانی ٢٠١١

**پەراوێز:**

* ئەم زانیارییانەی، کە لەنێوانی دوو کەوانەی پێکەوەییدا دامناون (()) هەموویانم لە ماڵپەڕێکی عەرەبییەوە وەرگرتووە، کە ناوی (سەقر ئەلشیمال)ە و بە دەستکارییەکی کەمەوە کردوومە بە کوردی.

# باختین و بیرۆکەی ڕۆمانی فرەدەنگی



**حەمە مەنتک**

میخایل باختین* زانای زمانناسی رووسی، بە مەزنترین تیۆرداڕێژەر لەبواری ئەدەبیاتدا دادەنرێت. لەبەستێنی زانستە مرۆڤایەتییەکان بە بەناوبانگترین هزرڤانی رووسی دادەنرێت. باختین داڕێژەری تەکنیکی فرەدەنگییە لەڕۆماندا. بێگومان ئەم تیۆر و بیرۆکەیەشی بێ پێشینە نییە. بیرۆکەی فرەدەنگی (چەند دەنگی) لە کن باختین لە رۆمانەکانی دیستۆفسکییەوە گەڵاڵە بوو. باختین لە کتێبی (پرسەکانی بەرهەمەکانی دیستۆفسکی) کە لەساڵی (١٩٦٣) بڵاویکردەوە، بە شێوەیەکی تایبەت رۆمانەکانی دیستۆفسکی بەرباس دەدات، لێرەوە بیرۆکی فرەدەنگی لە کن بەرجەستە دەبێت. "باختین ئەوەی راگەیاند دیستۆفسکی داهێنەری رۆمانی فرەدەنگییە، لەبەرئەوەی ئەمە بەشێکی گرنگە لە رۆمانەکانی، هەر ئەمەیشە بەرهەمەکانی کردووە بەداهێنان"[١]، دواتر باختین لێکۆڵینەوەکانی فراوانتر کرد، رۆماننووسانی فەڕەنسی و ئەڵمانیشی گرتەوە.

بیرۆکەی فرەدەنگی لە کن باختین سەرەتا لە زمانەوە هات، چونکە باختین دژی بۆچوونەکانی سۆسێر لە زماندا بوو، سۆسێر زمانی بە دەربڕینێکی تاکدەنگی دادەنـا، بەڵام بیرۆکەی سەرەکی باختین بۆ ئاخاوتن گفتوگۆیە (dialogism) ئەمەیش هەڵوێستێکی ئاشکرا و روون بوو دژی ئەوەی پێی دەگوترێت کارلێکردنی تاکانە لە زانستی زماندا، بەڵام دایەلۆگ لە کن باختین

مانایەکی فراوانتری هەیە، کە دەکارێت چوار تێگەیشتنی جوایەزی هەبێت:

١- تێگەیشتنی یەکەم، بۆ ئەو کارلێکە بەردەوامەی نێوان زمانەکان دەگەڕێتەوە، کە پاشتر دەبێتە هەڵگری ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی، لە ئاخاوتن و کۆمەڵگە.

٢- تێگەیشتنی دووەم، ئاماژە بەو ڕاستییە دەدا کە هەر ئاخاوتنێک پێوەندارە بە هەموو ئەو ئاخاوتنانەی لە هەمان جۆر و هەمان بابەتن، کە بەهەزاران داوی دیالۆگەوە پێکەوە بەستراون ئەمەیش بە ( التناص- Intertxtuality) ناودەبرێت.

٣- تێگەیشتنی سێیەم، ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات، کە هەر ئاخاوتنێک بەتایبەت ئەگەر دەقێکی نووسراوی بەتاڵ کار لە هەر دیالۆگێک بکات، کاریگەرە بە ئاخاوتنی پێش تری، بە ڕای باختین" هەر وتەیەک بەجۆرێک وەڵامی وتەی پێش خۆیەتی و لە چاوەڕوانی وەڵامی پاش خۆیەتی"[٢].

٤- تێگەیشتنی چوارەم، ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات، کە ئاخاوتنی کەسانی تر و شوێنێک لە ئاخاوتن و ڕستە دەربڕدراوەکانی هەر قسەکەرێک داگیردەکات، ئەمەیش ئەوەیە پێی دەڵێن (فرەدەنگی) کە باختین ئەم زاراوەیەی بۆ گونجانی جۆراوجۆری و جوایەزی زمانەکان بەکاربرد.

باختین فرەدەنگی وەک حاڵەتێک لە حاڵەتەکانی دیالۆگ دانا، بە مانا و تێگەیشتنە فراوانەکەی. هەر ئەم ڕوانگەی باختین بۆ زمان بوو، کە بەرەو توێژینەوەی لە ڕۆماندا برد. لێرەوە بیرۆکەی ڕۆمانی فرەدەنگی لە کن باختین درووستبوو، کە ڕەگ و ڕیشەکەی بۆ فێستیڤاڵی کارناڤێڵ دەگەڕێتەوە. ئەم ڕۆمانی فرەدەنگییە، بە تەواوی جیاوازە لە ڕۆمانی تاکدەنگی، وەکو ڕۆمانەکانی دیستۆفسکی. "تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ڕۆمانی چەند دەنگی بریتین لە جۆراوجۆری دەنگەکان و ژمارەی زۆری هۆشیارییە جیاجیا تاکەکەسییەکان کە هەر کام لەمانە بە شێوەیەکی جیا و سەربەخۆ و کراوە ئاراستە دەکرێت"[٣]

هەروەکو پێشتر ئاماژەماندا کە ڕەگ و ڕیشەی تیۆری ڕۆمانی فرەدەنگی کارناڤێڵە. کارناڤێڵ ئەو کلتوورە جەماوەرییەیە دژی کلتووری چینی باڵادەست.

کارناڤێڵ ڕووداوێکی جەماوەری ڕەخنەگرانەیە بەرانبەر فەرهەنگی فیودالی، ئەم کلتوورە جەماوەرییە سێ تایبەتمەندی هەیە:

١- دووچەشنی (ambivalence).

٢- فرەدەنگی (polyphony).

٣- خەندە.

باختین لە دوو بەرهەمی گرنگی خۆی (فرانسوا رابیلێ و پرسەکانی بەرهەمەکانی دیستۆفسکی) تێدەکۆشێت تا بەرهەمی ئەم دوو نووسەرە بەپێی نەریتی کارناڤێڵ راڤەبکات. لێرەوە ئەو راستییە خۆی ئاشکرادەکات، هەر تیۆرەیەک لە ئەدەبدا رەگ و ریشەیەکی هەیە و لە سەرچاوەیەکەوە هاتووە. سەرەتا با بزانین کارناڤێڵ چییە؟

کارناڤێڵ (کەرنەڤاڵ) بەواتەی ئەو فێستیڤاڵە جەماوەرییانە دێت کە سازدەکرێت. ئەم کارناڤێڵە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، جۆرێک لە فەرهەنگی رەخنەگرانەیە کە دەسەڵاتی تاکڕەهەند و فیودالی کلێسا دەخاتە ژێر پرسیارەوە ئەویش لە رێی پێکەنین و گاڵتەوە. " پێکەنینی جەماوەری لە کارناڤێڵەکاندا رزگاربەخشی ئەو مرۆڤانەیە لە کۆتوبەندی کلتووری رەسمی و جیددی و وشکی دەسەڵاتی دوور لە جەماوەر. لە دەنگی کارناڤێڵدا هەموو شتێک پێچەوانە دەکرێتەوە: پاشا دەبێت بە گەمژە و گەمژە دەبێت بە پاشا، لە کارناڤێڵدا بیری ئایینی و بیری نا ئایینی تێکەڵ یەکتری دەکرێن. زانا و نەزان لە پاڵ یەکتردان و لە ئەنجامدا جیهانێکی بەراوەژوو و پێچەوانە دەخوڵقێندرێت. بەم پێیەش رەوتی زنجیرە قوناغەکان لەناو دەچێت و رابەری و یەکسانی دێتەگۆڕێ. ئەم تایبەمەندییانەی کارناڤێڵ، کە تێیاندا فرەچەشنی و جۆراوجۆری دەبیندرێت و مۆرکی سەرەکی هەر هەمووشیان فرەدەنگییە، لە رۆمانی چەند دەنگییدا بەسانایی بەرچاودەکەوێت"[٤]

کەواتە لە کارناڤێڵدا جۆرەها دەنگ دەبیسترێت، جۆرەها رەنگ دەبینرێت، ئەمانەیش هەمووی دژی یەکدەنگییە، چونکە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا تەنێ یەک دەنگی بوونی هەبوو، ئەویش دەنگی پاشا بوو، یەک ئایدیۆلۆژیا بوونی هەبوو، ئەویش ئایدیۆلۆژیا و بیرکردنەوە مەسیحیەت و کلێسا بوو. ئەمانە هەمووی وایکردبوو دەنگەکانی تر کپ بکرێت. لێرەوە ئەم فیستیڤاڵە جەماوەرییە سازدەکرا. لە وێوە جۆرەها دەنگ لە رێی گاڵتەپێکردن و خەندەوە دەنگی خۆیان هەڵدەبڕی، لەم رێیەوە جوتیاران، توانیان رەخنە لە سیستمی فیودالی بگرن، چونکە پێشتر جوتیاران و خەڵکی هەژار لە کایەی ئابووری، سیاسی، کلتووری توانای ململانێیان نەبوو، بەڵام ئەم ململانێیە لە کارناڤێڵدا بە روونی بەرچاودەکەوت. دواتر ئەمە وەکو جەژنێکی جەماوەری قەبووڵکرا. لەم کارناڤێڵەدا جەماوەر نەک هەر رەخنە لە پاشا و کلێسا دەگرن، بەڵکە گاڵتەشیان پێدەکەن، تەنانەت رەخنە لە خۆشیان دەگرن. ئەم رەخنەگرتنە بووە هۆی ئەوەی دەنگی جیاواز بێتە ناوەوە. ئەم دەنگانە لە ژێر دەسەڵاتی تاکدەنگی کلێسادا دەردەچن و دەبنە خاوەنی خۆیان.

باختین سوودی لەم سیستمی فرەدەنگی و فرەڕەنگی و رەخنەگرتنەی کارناڤیلدا وەرگرت و بۆ نێو ئەدەب گواستییەوە. لە ئەدەبیشدا بۆ نێو ژانری رۆمان. بۆ ئەمەیش رۆمانەکانی (دیستۆفسکی) وەرگرت. بەڵام هێندێک رۆمانەکانی تۆلستۆیان بە رۆمانی فرەدەنگی داناوە، ئەمەیش هەڵەیەکی گەورەیە، بەتایبەت ئەگەر ئەم هەڵەیە لە نامەیەکی زانستی و ئەکادیمی بکرێت. لە نامەی ماستەری (رێزان رەحمان خدر) بە نێونیشانی (تەکنیکی گێڕانەوە لە رۆمانەکانی عەبدوڵلا سەڕاج)دا* لەلاپەڕە (٣٤) فرەدەنگی بەرباس دراوە، تۆلستۆی بە یەکێک لەو رۆماننووسانە هەژماردەکات، کە رۆمانی فرەدەنگی نووسیوە، بەڵام لە راستیدا رۆمانەکانی تۆلستۆی رۆمانی تاکدەنگین، میخایل باختین نموونەی ئەمەمان بۆ دەهێنێتەوە کە رۆمانەکانی دیستۆفسکی فرەدەنگییە، پێچەوانەی رۆمانەکانی تۆلستۆیە کە تاکدەنگییە، ئەمەیش بێ ئاگایی توێژەرە لەم بوارەدا، هەروەها بێ ئاگایی لێژنەی گفتوگۆی ئەم نامەیەیە.

دایەلۆگ و مەنەلۆگ لە کن باختین دوو تەکنیکی گرنگ بوون، لە بەرئەوەی بە هۆی ئەو ئەرک و رۆڵەی لە ئەستۆیانە زۆر شت ئاشکرا دەکەن. " هەر لە ئاستی هونەری کەسایەتییەکان، رۆشنبیریان، کۆمەڵایەتیان، سیاسیان، ئابووریان، ئاستی دەروونیان، بۆیەش دایەلۆگ گۆکردنێکی هونەریانەیە بۆ ئاشکراکردنی راستییەکان، لە دایکبوونی راستییەکان و پێشکەشکردنیان لە چوارچێوە و دیوێکی جوانیناسانە"[٥] تەکنیکی دایەلۆگ لە فیستیڤاڵی کارناڤیلدا بە شێوەیەکی زۆر بەرچاودەکەوێت. لێرەوە دەنگەکان لەگەڵ یەکدیدا دەکەونە گفتوگۆ، بۆ ئەوەی هەر دەنگە و تەعبیر لە بیروبۆچوونی خۆی بکات. کەسیش رێ لەویدی ناگرێت، بەهۆی ئەمەوە زانیاری و راستیمان بۆ دیاردەکەوێت، بەهۆی ئەوەی لەم گفتوگۆیەدا زانیارییەکان لە رێی پرسیار و وەرامدانەوەوە کەشف دەبن.



وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، بیرۆکەی فرەدەنگی لە کن باختین لە تێڕوانینی بۆ زمان بوو، چونکە لە کن باختین هەر گوتەیەک دەبێتە بابەتی گوتەیەکی تر. بەو مانایەی کاتەک دوو کەس لە دیالۆگدان، لە ئەنجامی ئاخاوتنیان کاتێک کەسی یەکەم پرسیار دەکات، دەبێت کەسی دووەم وەرامی بداتەوە، لە ئەنجامی وەرامەکە پرسیاری تر، گوتەی تر درووست دەبێت. لێرەوە چەند دەنگی دێتەناوەوە، تەنێ یەک دەنگی زاڵ نابێت، کەواتە دیالۆگ خاڵێکی بنەڕەتییە لە رۆمانی فرەدەنگیدا.

دیستۆفسکی لە کن باختین داهێنەرێکی مەزنە. رای وابوو دیستۆفسکی یەکێکە لە گەورەترین نوێکەرەوەکان لە مەیدانی ژانری رۆماندا، چونکە تەکنیکێکی داهێنا ئەویش فرەدەنگییە (polyphony). باختین کۆی رەگەز و بنەماکانی رۆمان لە کن دیستۆفسکی لەسەر ئەو دەنگە جیاوازانەی لە رۆمانەکانیدا هەن دیاریدەکات. ئەمەیش بووە هۆی شکاندنی ئەو شێوە باوەی رۆمان کە زێتر پشتی بە گێڕەوەی هەمووشتزان دەبەست. لێرەوە دید و تێڕوانینێکی نوێ بۆ توێژینەوە لە رۆمان هاتەکایەوە.

چەمکی فرەدەنگی لە رۆمانەکانی دیستۆفسکی لە کن باختین جێی بایەخ بوو. لە وێوە باختین گەلێک کەلێنی نوێی دۆزیەوە، لەوێدا یەک گێڕەوە و کارەکتەر دەسەڵاتدار نابێت" یەکێک لە ئەندێشەکانی تیۆری فرەدەنگی، چەمکی ئەویدی بوونی منە. من - سـەرەڕای ئەوە کە منی نووسەر (ڕاوی) یان یەکێک لە قارەمانەکان بێ- ناتوانێت بە تەنیا گشتێتی خۆی دەربخات. ئەویدی و دەنگی ئەو بۆ دەرخستنی من – کە ناسنامەی لانیکەم تاڕادەیەک لە ئەویدی بوون دایە- پێویستە. من ناتوانم خۆم ببینم و خۆم راڤەبکەم"[٦] لێرەوە ئەگەر یەک گێڕەوە بوونی هەبێ، ئەوا لەبری کارەکتەرەکانی دی دەپەیڤێ و بیردەکاتەوە، بۆیەیش لە فرەدنگییدا بە هۆی بوونی چەند دەنگ، هەر دەنگە دەبێتە هۆی سەلماندنی بوونی دەنگی تر، چونکە کەسی بەرانبەر دەتوانێت بوونی ئێمە بسەلمێنێت، ئەمەیش رێک قسەی هایدیگەرمان بیردەخاتەوە، کە کەسانی بەرانبەرمان پێشمەرجی بوونی ئێمەن. کاتێک لەگەڵ کەسی بەرانبەر پەیڤ و گفتوگۆ دێتە ئارا بوونمان زێتر دەسەلمێنرێت. لێرەوە باختین شکستی بە دیسکۆرسی تاکدەنگی هێنا، چونکە " لە روانگەی باختینەوە زمانی رۆمان دەبێت لە کۆمەڵێک دیالێکتی کۆمەڵایەتی جیاواز پێک بێت. ئاخر زمانی هەر نەتەوەیەک بریتییە لە چەند دیالێکتێکی کۆمەڵایەتی جیاواز و شێوازی دەربڕین کە بەگوێرەی نەوە، تەمەن، پیشە و بیرکردنەوە لە یەکتری جودان" [٧]

فەزای گشتی رۆمان وەکوو کۆمەڵگە وایە، چون کۆمەڵگە جورەها مرۆڤی

تێدا دەژی، بە زمانی جوایەز، بیرکردنەوەی جوایەز، ئایدیۆلۆژیای جوایەز، پیشەی جیاواز، بە هەمان شێوە لە رۆماندا چەندان کارەکتەرمان بە هەموو ئەو جیاوازیانەی سەرەوە بەرچاو دەکەون. هەر یەکەیان بیرکردنەوە و زمانی ئاخاوتن و کاری جیاوازیان هەیە، هەر بەو زمان و بیرکردنەوە جیاوازانەش تەعبیر لە خۆیان دەکەن. لێرەوە رۆمانەکە زمانێکی فرەرەهەند وەردەگرێت. واتە نووسەر و لە هەمان کاتدا گێرەوە ئەو دەسەلاتەیان بەسەریەوە نامێنێت، ئەمەیش هەنگاوێکی ترە بۆ ئەوەی رۆماننووس زێتر لە زمانی ئاخاوتن و ناخی کارەکتەرەکان نزیک بێتەوە، یان روونتر لە زمانی شیعری دوورکەوێتەوە، دەکرێت ئەو زمانە شیعرییە بە کارببردرێت وەکو لە رۆمانەکانی (هێرمان هیسە)، لە ئەدەبی کوردیدا رۆمانەکانی (بەختیار عەلی، جەبار جەمال غەریب، سەلیم بەرەکات). بەلآم نابێت کار لە زمانی کارەکتەرەکان بکا، چونکوو زمانی ئاخاوتنی کرێکارێک لە رۆماندا جیاوازە لە زمانی مامۆستایەکی زانکۆ. رۆمانەکانی (نەجیب مەحفووز) زێتر زمانێکی رۆژانەیە و هی نێو گەرەکەکانی قاهیرەیە، هەروەها رۆمانەکانی (فەرهاد پیربال) بە هەمان شێوە لە زمانی خەڵکەوە نزیکە.

بە رای باختین" رۆمان لە چەندین توێژی گوتار پێکهاتووە کە بە شێوازی جۆراوجۆر لە پەنای یەکتر ریز دەبن، هەندێکیان هاوئاهەنگ و رێکوپێک و هەندێکیشیان بە شیوەی دژواز بەرامبەر بەیەک"[8] ئەم گوتارانە رێخۆش دەکەن بۆ گێرانەوەی جیاواز، کارەکتەرەکان هێندێکجار رۆڵی گێرەوە دەگێرن. گێرانەوەی بەشێک لە رووداوەکانیان دەکەوێتە ئەستۆ، بەلآم لێرەوە توانای رۆماننووس بە دیاردەکەوێت، لەوبارەوەی تا چەند لە توانایدایە گێرانەوەی ئەو کارەکتەرانە بە یەکەوە گرێ بدات. دەنا هەر گێرانەوەیەک زەمینە بۆ گێرانەوەی دوای خۆی خۆش بکات. ئەگەرنا هەست بە بۆشایی لە نێوان گێرانەوەکان دەکرێت. ئەم رایەڵە گشتییە بۆ رۆماننووس و ئەدەبی گێرانەوە زۆر پێویستە. ئەگەر لە (هەزار و یەک شەوە) بروانین چەندان دەنگی جیاوازی تێدایە، کە من بە نموونە هەرە جوانەکانی گێرانەوەی فرەدەنگی هەژماردەکەم، چونکە هەر چیرۆکە زەمینە بۆ چیرۆکی دوای خۆی خۆش دەکات. بە بێ ئەوەی خوێنەر هەست بە بۆشایی(سپێس) لە نێوانیاندا بکا. بۆیەیش بە رای من باختین زەحمەتە ئاگەداری (هەزار و یەک شەو)ە بێ، ئەگەر نا لە پێش رۆمانەکانی دیستۆفسکی ئەم بەرهەمەی بە گێرانەوەی فرەدەنگی هەژماردەکرد. ئەم زەمینە خۆشکردنە توانای رۆماننووس لە چنینی گرێچنی رۆمان وەدەردەخات، لە وێوە رایەڵەکانی تری تەکنیک خۆیان دەردەخەن، چونکە هەموویان وەکو تەونی جاڵجاڵۆکە بە

یەکەوە چنراون. کەواتە سەربەخۆیی کارەکتەرەکان لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان کار لە بونیادی تەکنیکی ڕۆمان دەکا.

هەوڵی باختین بۆ بەرهەمهێنانی ئەم تەکنیکە، هەوڵێک بوو بۆ داهێنانی شێوازێکی نوێ لە ڕۆماندا، چونکە لە ڕۆمانی فرەدەنگییدا هەروەک میلان کۆندێرا بەرباسی دەدا، هاوسەنگبوونی دەنگەکانە، کۆندێرا دەڵێت: "مەرجە هەرە پێویستییەکانی ڕۆمانی فرەدەنگی بۆ من ئەمانەن:

١- هاوسەنگی تان و پۆکان.

٢- دابەشنەبوونی گشت."[٩]

مەبەستی کۆندێرا ئەوەیە نابێ دەنگێک لە سەرووی دەنگی ترەوە بێت. هەر دەنگە و خاوەنی تایبەتمەندی و دنیای خۆیەتی، ئەمەیش ڕێ بۆ کارەکتەرەکان خۆش دەکات، بەوپەڕی ئازادییەوە بپەیڤن. تەنانەت خوێنەریش لەم حاڵەتەدا هەست بە بێزاری ناکات، چونکە لە ڕۆمانی تاکدەنگییدا خوێنەر هەست دەکات کەسێک لە بەرانبەری دانیشتووە و یەک حەکایەتی بۆ دەگێڕێتەوە، هەموو ڕووداوەکـان بە هۆی ئەوەوە ڕوودەدەن، یەک کارەکتەری هەیە. بەڵام لە ڕۆمانی فرەدەنگییدا خوێنەر هەست بەدەنگی جیاواز، ئایدیۆلۆژیای جیاواز، کێشە و گرفتی جیاواز دەکا. " ڕۆماننووس دەبێ شێوازێکی تایبەت بۆ نووسینی ڕۆمانەکەی دابنێت، تا لەم ڕێیەوە بە شێوەیەک پێوەندی لەگەڵ خوێنەرانی خۆیدا دابمەزرێنێت کە خوێنەر هەموو شتێک بە تەواوی دەرک بکات و بەشداری لە ڕووداو و کێشەکانی جیهانی نووسەر بکات"[١٠] ئەم ڕاکێشانی خوێنەر بۆ نێو کەشی ڕۆمان هەروا بەسادەیی نایەتە دی، ئەگەر بونیادی ڕۆمانەکە پتەو نەبێت. باختین هەموو ئەوانە بۆ چۆنیەتی ئەو زمانەی ڕۆمانەکەی پێدەگێڕدرێتەوە دەگەڕێنێتەوە. لێرەوە ڕۆمان لەو شێوازە داماڵدرا کە ڕووداوەکانی بۆ باسکردنی پاشاکان و قارەمانێتیان قۆرخ بکرێت، زمانەکەی ئەو زمانە باڵایە نەما، بەڵکە ڕۆمان هات ژیانی بەندەیەکی بەرباسدا، کارەکتەرەکانی نێو ڕۆمان سەربەخۆییان لە گێڕانەوە وەرگرت. بوونە خاوەنی دەنگی خۆیان و کێشەی خۆیان لە نێو ڕۆماندا، ئەوانیش ڕێیانپێدرا کێشەوگرفتی خۆیان بەرباس بدەن. لێرەوە ڕۆمانی نوێ ئەرکێکی قورس تری کەوتە سەرشان، چونکە ڕۆماننووس دەبێ لە هەوڵی ئەوەدا بێ ئەو دەنگە جیاوازانە بکاتە خاوەنی دەنگی خۆیان لە ژێر ڕکێفی گێڕەوەی هەمووشتزان دەریان بهێنێت.

هەروەک پێشتر کارناڤێلمان بەرباسدا. لەوێدا کارەکتەرەکان گاڵتە و گەمە بە دەسەڵات دەکەن، واتە گاڵتە وەکو ئامرازێکی ڕووبەڕووبوونەوە بە کاردەبەن.

باختین لەمەوە ئەوەی گواستەوە کە کارەکتەرەکان توانای پەیڤینی خۆیان هەبێت، هاواربکەن. هونەری رۆمان لە کن باختین وەکو ژانرێکی تازە، گاڵتەکردن بوو بە عەقڵی خۆبەزلزانەکان، جوانترین نموونەیش بۆ ئەمە (دۆن کیشۆت)ی (سێرڤانتس)ە. بۆیەیش لەوێدا کاتێک کارەکتەر دەبێتە خاوەن دەنگی خۆی، لە ڕێی بە کاربردنی زمانی ئیماژەوە، وەکوو دەروناسێک ئەم هەستانەی خۆی کە لە بنەڕەتدا رەخنەن دەردەبڕێت. کەواتە رۆمان باشترین ژانرە کە لە ڕێیەوە بتوانین ئازادانە بکەوینە رەخنەگرتنەوە، چونکە لە رۆماندا سەرووکارمان لەگەڵ چەندین کارەکتەردا هەیە، هەر کارەکتەرە و دەبێتە نوێنەری چینێک. بۆ نموونە ئەگەر لە رۆمانی (گرەوی بەختی هەلاڵە)ی (عەتا نەهایی) بڕوانین. چەندین کارەکتەرمان لە چینە جوایەزەکانی نێو کۆمەڵدا هەن. (حەمە رەشید ئاغا) نوێنەری دەسەڵاتی نێو کوردە، (شێرزاد) وەکو کۆیلەی ئەو دەسەڵاتەیە،(هەلاڵە) کچێکی یاخییە و حەز بە پێشکەوتن و تێکەڵاوبوونی کلتووری دەکات، لە هەمان کاتدا دەبێتە قوربانی، (مامۆستا سەعید) نوێنەری چینی رۆشنبیرە. لێرەوە رۆماننووس زۆر بە وردی و سەرنجەوە کارەکتەر و ئەو ژینگەیەی دەبێ تێیدا جووڵە بکات هەڵبژاردووە. (هەلاڵە) هەر لە منداڵییەوە کەسێکی عەجوول و یاخییە، کە دەگاتە سویدیش لەوێش زوو تێکەڵاوی ئەو کلتوورە پێشکەوتووە دەبێت. بەشێک لە گێڕانەوەی رووداوەکانیشی خستۆتە سەرشانی کارەکتەرەکان. لێرەوە کارەتەرەکان لەم رۆمانەدا گۆشەنیگای تایبەت بە خۆیان هەیە. ئەگەر سەیری دیالۆگەکانی (هەلاڵە) بکەین، هەست بەوپەڕی یاخیبوون دەکەین، ڕووبەڕووی دەسەڵات دەبێتەوە کە نوینەرەکەی (شێرزاد)ە و خەنجەری کلتووری دراوەتێ. هەوڵدانی (هەلاڵە) بۆ گۆڕینی کلتوور هەوڵێکە مەگەر بەژانرێکی وەکو رۆمان دەرەقەتی بێین، رەنگە ئەمە بەشیعر نەکرێت.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان:

*باختین: ناوی میخاییل میخاییلۆڤیچ باختین لە ساڵی ١٨٩٥لە ئورل لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی بە رەگەز ئاغاواتییەوە لە دایک بووە. باوکی فەرمانبەری بانک بوو. باختین لە ئورل منداڵیەتی

تنیپەڕکردووە. لە زانکۆی ئودسا و پیترسبورگ دەستیکرد بە خوێندنی واژەناسی و لە سالی ١٩١٨ بە کالۆریۆسی وەرگرت. پاشان هەر لە ئورل دەستی بە وانەبێژی کرد. لە سالی١٩٢١ ژنی هێنا. یەکەمین ئالقەی (هاوڕێیانی هاوبیر) بە بەشداری چەندین شاعیر و نووسەر پێکهات. لەسالی١٩٣٨ بەهۆی نەخۆشییەوە لاقێکی لێدەکەنەوە. چەندین کتێبی لەسەر زمان و تیۆری ئەدەب نووسیوە، تا سالی ١٩٧٥ کۆچی دوایی دەکات. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سەودای وتوویژ، میخایل باختین، و: بەختیار سەجادی، دەزگای موکریان، هەولێر،٢٠٠٨، ل٤١.

١- قضايا السرد الابداعي عند دستويفسكي، ميخايل باختين، ت: جمال نصيف التكريتي، بغداد، ١٩٨٦، ص١١– ١٢.

٢- سەودای وتوویژ، میخایل باختین، و: بەختیار سەجادی، دەزگای موکریان، هەولێر،٢٠٠٨،ل٦.

٣- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١.

* بۆ زێتر بەرچاو روونی بڕوانە:( تەکنیکی گێرانەوە لە رۆمانەکانی عەبدوڵلا سەراجدا، ریزان رەحمان خدر، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی سەلاحەددین، نامەی ماستەر،٢٠٠٧، ل ٣٤.

٥- تعدد الاصوات في الروايه العربيه، د. حسن عليان، مجله جامعه دمشق،مجلد ٢٤،عدد١-٢، ٢٠٠٨، ص١١٧.

٦- خەندە، کەرنەڤاڵ. رۆمانی فرەدەنگی، پیەر.ڤ. زیما: www.proosha.blogfa.com

٧- رۆمانێکی بە زمانی شیعر نووسراو، حەمە سەعید حەسەن،www.klawrojna.com

٨- لە دەستنووسەوە بۆ ئازارەکانی مرۆڤ، ئارام سدیق: www.dengekan.com

٩- هونەری رۆمان، میلان کۆندێرا، و: کەریم پەڕەنگ، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١٢٣.

١٠- رۆمان چییە؟، کۆمەڵێک نووسەر، و: جەواد مستەفا، دەزگای موکریان، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٢٥.

# تەرمی قاقاکان



**پەری شێخ سالح**

**کە هاتی**
**بەرلەوەی ئەم تەپوتۆزی ئازارە بنیشێتەوە...**
**لەگەڵ دەستا**
**نمێ لەو سووتووەم بۆ بێنە**
**کە دۆزەخی تێکەڵبوون هەڵیوەران**
**با ئەم ژیلەمۆیە**
**لەم چۆڵی مەحشەرەدا هەر بدرەوشێتەوە...!**
**بائەم لێکبزربوونە**
**کە خەیاڵمان دەبزرکێنێ**
**باڵی فرینمان هەڵنەوەرێنێ...**
**بیرت نایە کە دەهاتی**
**لەناو خەیاڵدانی دڵا**
**بەژنی هەرچی درەخت هەیە**
**پرت دەکرد لە گوارەی گەڵا..؟**
**کەچی ئێستا**
**سەرت خستۆتە سەر رانی درەختێکی بێناز**

چیتر داوای هیچت لێ ناکەم
شەختەبەندی ئەم شێتییە
نە لە باخی منا گێلاس دەگرێ
نە لە منا دووگیان دەبێ...
بۆ ژیان پێکەوە بووین
بەڵام ئەم هەناسەیەمان
هەناسەی کۆتاییە
کێ بە بینینی ئێمە نیگەران دەبێ...؟
کێ خەمی ئێمە دەدوێنێ...؟
دوای ئێمە چ بوونەوەرێک
لەسەر شەقامەکان جێ دەمێنێ...؟
ئەوان تەنها درێژە بە هەنگاوە هەمیشەییەکان دەدەن
خۆر و هەنگاوەکان وەک ئێمە لەناو یەکدا ون بوون
لەنێوان دەمان و زەردەخەنەکانماندا
تەرمی هەموو قاقاکان کەوتوون
بە هەموو ئادەمێ دەڵێم
خۆرێک دەناسم
دوور... دوور
بەقەد دووری من و دارخورمای بیابان
تەماشام مەکە
فرمێسکەکانم وەک جاران
دەستڕەنگین نین
ناتوانن نمایشی تیمساحیانەت بۆ بکەن
جا چۆن بتوانم جارێکی تر بێمەوە
چۆن بتوانم جارێکی تر
لەناو ئاپۆرەی ئەم خەونەدا بتوێمەوە؟



# سێ کورتە شیعر



کولسوم عوسمان پوور



(١)

جیاوازی نێوان

من و تۆ

هەست و فامی دەور و زەمانە

بەیانی تا شەو

لای تۆ رۆژێکە...

لای من،

بیستوچوار شەستی دەورانە

***

(٢)

کە دەنگ هەڵدێنم

تۆ دەتوێیتەوە

تۆ دەتوێیتەوە

تۆ دەتوێیتەوە

دەبیە چۆڕێ ئاو

ئەمەیە حاڵی شێرەبەفرینە

وا سەر هەڵدێنێ

رووبەڕووی هەتاو...!

***

(٣)

ئەوەندە ژنم
هەر لەبار ئەچێ سەر سەوزیم
وا ئەزانم
لەدووتوێی پەردەی ئەم ماڵە
وا چاوشارکێی تیشکانەیە
کەمێک دڵەڕاوکێ ماوە
کەمێک وشەی ڕۆشن کەمە
بۆ وجاخم
بۆ وجاخت
دام ئەچڵەکێنێ، گێجەنەی ئەم دەرگایە
وەخت و بێ وەخت
بڕیار بدە
گەڕانەوەت
کەمتر لە زەختی خوێنم بێت!

***

سنە/ زستانی ١٣٩٠



# ناسک، ناسک،
# ئاڵ، ئاڵ
# شەپۆلی دڵم ئاوبدە



لە کەژاڵ ئیبراهیم خدر

-١-

بە شەوو ڕۆژ لێم دەڕوانیت
هێندە وردی
لە کانی چاوت وردبوومەوە
کاتێ زانیم ناسک ناسک
بەسەر دیدەی تۆدا دەگریم
بووم بە منداڵ ژێربوومەوە

-٢-

من نازانم فریشتە بووی
یا گوڵێکی باخچەی ئاشتی
بووی بە پۆلێ ئەستێرەی گەش
بوویتە پەڵەی هەوری سپی و
لەسەر خونچەی گوڵی لێوم
زۆر بە ئەسپایی دانیشتی

-٣-

پەنجەکانت لەسەر مانگ و
تریفەی سینەم هات و چوون
لەناو خۆیاندا نەغمەی سپی و
بوونە کلوە شیعر و
قژی رەشیش
بە چەند پۆلێ پەڕەسێلکە
منیش بووم بە ئاواز و
خەرمانە، بۆ خۆشەویستی



-٤-

ئەوەندەی خۆت دایە
بەر هەوازی شەپۆلی رۆحم
تا وام لێ هات
لە زمانی سێبەری ئاو گەیشتم
بۆیە هەردەم ئەو شەپۆلە ئەناسمەوە
نازناوی تۆی هەڵگرتووە

-٥-

هەموو رۆژێ جارێک ئەبی بە پەپوولە و
ئاڵ ئاڵ، گەش گەش
لەسەر پەرەی گوڵەکانم دێیت و دەچی
لە خەوێکدا بووم بە ماسی
بە زمانی ئاو ئەمنووسی
دڵۆپەکان بوون بە وشە
قەڵەمەکەم بە رێواسی بەهار
شەپۆل بە دەفتەری عەشقم

-٦-

من لەوەتەی تۆم ناسیوە
هەموو کەسێ هەموو شتێ
ژن بێ یا پیاو، دار بێ یا بەرد
پەرداخێ بێ، یا شەرابی عەشق نۆشین
لەلام ئەبنە گوڵی شیعر

-٧-

ئەو دولبەرە عاشقە
ئەوەندە شیعری منی خوێندۆتەوە عاشقیەتی
ئەزانن خۆشەویستی منە
لە خوێندنگەش
هەروەڵامێک بنووسێتەوە
وشەکانی کۆتری شیعری منە و
پەپوولەی هەست و خەیاڵی، باڵای منە

-٨-

کە تۆ هاتی چی بەستەڵەکی بەفر بوو توایەوە
هەرچی جوانی ناو سرووشتی تارمایی بوو
خۆی شاردەوە
کاتێ بینییان سەما دەکەیت
سنووری دڵم داگیر دەکەیت
بوویتە بووکەشووشەی منداڵی و گەشایتەوە

-٩-

تارمایی ژیان سێوێکە دوولەت
چەندین ساڵە دەبنە خامۆشی و بێدەنگی
بەڵام زامێکی زۆر قووڵە
وەکو شیعر خەیاڵ دەگرێ
ئەوەندە لێمان نزیکە
هێند ناسکە
وەکو رەزی ترێی کوێستان
ئەمڕۆمان چاوی لێیەتی

-١٠-

کاتێ شیعر دەخوێنمەوە
دەنگم دەبێ بە ئاواز و
وشەش بە گڕ
ئەو کاتانە تەنها لە بەردەمی تۆدا
دەخوێنمەوە
شیعر دەبێ بە هەڵۆیەکی بەرزە فڕ



-١١-

رووبارێکم نیوەی ئاوەکەم
لە خۆشەویستی بەفری قژتەوە بۆ هاتووە
نیوەی ترم
لە کانیاوی چاوەکانت بۆیە
بەردەوام دەڕۆم و وشک ناکەم

-١٢-



کە ترس پەلاماری دام
خۆم بە گەردەلوولی چاوتەوە
هەڵواسی و هێندەی نەبرد
رەشەبا خستمییە خوارێ
کەوتمە بەهاری ئەوینتەوە
بووم بە چڵێ نێرگز، بووم بە شنەی شەماڵێ

-١٣-

سێبەرێکی بەر هەتاوێکی ناوەختی
تینوویەتی دڵم دەشکێنی
رێگەی ئازادی شیعرم لێ ون دەکەی
من دەمەوێ لەدوای فڕین
بە ئازادی بێتە وەڵام
رەنگی ئاسمانی چاوانت و
شەپۆلی دەریای هەناسەت
جوانی بداتەوە رۆحم

-١٤-

حەزم دەکرد لە کونجێکی ئەم ژیانە پیاوبوومایە
بەومەرجەی لە قووڵایی دڵمەوە
هەر وەک ئێستا
خاوەن هەست و سۆز بوومایە
حەزم دەکرد ئاوێنەی هێشووە ترێی
ژووری خەوبینینی تۆبام
هەموو سپێدەیەک بەر لە رۆیشتن
چاوم رووخساری تۆی ببینیایە

-١٥-

حەزم دەکرد چڵێ نێرگزی کەناری
خەونەکانت،
بەر لە بروسکەی زەردەخەنە و
بەر لە شکانی پارچە شووشەی دڵم
هەموو بەهارێک بە ئێخە و سنگی تۆوە
تێر تێر بۆنت کردبام
حەزم دەکرد بوویتایە تریفەی مانگەشەو
هەموو شەوێک
بڕژایە شکانی ڕۆحمەوە
گەرووی وشکەوەبووی تەڕکردایە و
لە ئامێزت گرتبام

-١٦-

حەزم دەکرد ڕووباری سەرەڕۆی سیروان و
نەغمەی ئاوازی بوولبوول و
شنەی شەماڵی ئێواران و
لەگەڵ نمەی هەناسەی تۆدا بڕۆیشتمایە
بۆدواجاریش حەزم دەکرد دوای مردنم
لە باوەشی تۆدا گۆڕیان بۆ هەڵ بکەندمایە

-١٧-

دڵی من
خوڕەی ئاو و پەڕەی گوڵ و
گڤەی باو پەپوولەی تێدایە
دڵی من
هەندێ جار تینویەتیت ئەشکێنێ
بۆنت پێوە دەکا و فێنکت دەکاتەوە
نەفرەت لە رابردوو دەکا و
وەکو کۆترێکی ئاشتی
بەسەر لق و پۆپی باڵاتدا دەنیشمەوە



-١٨-

بە بەر تیشکی زەردەپەڕدا
ئەچووم بۆ لای عاشقی چاوەڕوانیم
وەختێ گەیشتمە بەردەمی
دەستم برد چوار پێنج گوڵم
لە باخچەی لێوم کردەوە و دام لە سەری

-١٩-

ئەو ساتانەی لەگەڵتابم
کۆترە باڵ نەخشینەکەی
نێو ڕۆحی تۆم
چۆنم بوێ ئاوا دەفڕم
کە لێم دووربیت
لە قەفەزێکدا بەند دەبم و ئۆقرە ناگرم



# من درزێکم لە ئاوێنەدا



هێرۆ کوردە



**تێپەڕبوون**

**لە ئاوێنەکەدا**
**رووخساری شکاوی دایکم دەبینم،**
**سووراو دەگرم بە دەستمەوە:**
**بۆنی شت و بۆنی کەس دێ.**

**درزێک منی لە من دابڕیوە**

**دەستی دایک**
**دەکەوێتە سەر شانم،**
**بۆنی دەست و**
**بۆنی من تێکەڵ دەبن؛**
**کە شکاوم**
**لە ئاوێنەدا.**

سووراو دەکەوێتە سەر زەوی و
لە درزی ئاوێنەدا
دەبمە بیرەوەریی دایکم.

### شەوی ڕووناک



گوناحم تێدا دەڕوێ
دەستەکانت وەک دوو تاریکی
بن عەبام ڕووناک دادێنن؛
دێیت و
چرات پێویست نییە.
تۆ دوو چرای
لە دوو شەوی
سەر ئەم گردانەی مندا
دەڕوێی.

### فرۆید لێرە نییە

بەر لە لێوەکانم پەنجەکانی پێمی مژی.
ئەگەر تۆ بێی
ئەوی دی دەڵێ:
ژێر پێت دەلێسمەوە.
پیاوە ریشڕەشەکەیش
پێڵاوەکانمی خۆش دەوێن چاوەکانم نا

پێیەکانم
زووتر دەڕۆن
زیاتر لە دڵدا گیر دەبن
دوێنێ بوو

یانیش پار
دڵنیا نیم
چاوم داخست؛
لێوم گەرم دانەهات،
پێیەکانمی تەڕ کرد
لێوە ئەستوورەکانی...

گەر هاتم
مەبەستم ئەوەیە گەر چووم
پێیەکانم نابەم
کە مردم
هەموو ئەوەی جێی دەهێڵم:
جووتێک پێی ژمارە سیوشەش لە زستاندا سیوحەوت
کە لەگەڵمدا نایەنە گۆڕەکەمەوە،
لەنێوان خۆتاندا دابەشی بکەن،
لێوی منتان کوشت،
من کچێکم
ئیرەیی بە پێیەکانم دەبەم.

لەسەرەوە چاوەڕێ بووم دۆزەخ ببینم
لە خوارەوە
خوارتر لە خوارەوەم
لێوەکان نیشتنەوە و
لێوم بۆگەنی کرد.

ریتمی جگەرە لەسەر لێو

لەبەردەمی وەستام
جلەکانم لەبەردەم خۆم...



بزەم کرد و
من هی خۆم نیم ئیتر تێمگەیاند

جگەرەکەی بەلاریی خستە سەر لێوی،
شەپۆلم دەدا
زەوی لەژێر پێمدا نەبوو
لە سنگدا دەلەرییەوە
وەستا
تەماشای کردم
دواجار
ئممممممممممممممممممم
هێرۆ!
من پێڵاوەکانتم دەوێ

جلەکانم بانگم دەکەن
تۆ پێڵاوەکانمت دەوێ،
منیش خۆم لەبەردەم تۆدا و
جلەکانم لەبەردەم خۆمدا و
جگەرەکەت،
کە بەلاریی دەیخەیتە سەر لێوت.



٢٠١١

# حیکایەتەکانی تەنیایی



بۆ ژاوێن شاڵی

سوپاس بۆ تەنیایی
وام لێ ئەکا
جارێکی تر بڕوانمەوە ئاوێنەکان
نەختێ لە میزاجییەتی ژیان دوورکەومەوە
پاسارییە نوستووەکان بێدار بکەمەوە و
سپەیسێ لە نائومێدیی دوورکەومەوە...
لەناو خۆیا مەستم ئەکا
وام لێئەکا
لەم تووڕەییە شێتانەیەم بێمە دەرێ
نەبوون نەکەمە گرفت و
پاساوێکی بەجێ بۆ (نا)کان بهێنمەوە
بەشوێن راوی راوچییەکانا نەگەڕێم و
بیر لە سەفەری ناوادەی (با) نەکەمەوە...

سوپاس بۆ باران

بێ وادەی دیاری خۆی
بە سیمای بەرائەتی منالییەوە
بەسەر تەنیایی ژوورەکەما دائەکا...
دائەکات و بێدەنگییەکی شیرین سەوز ئەبێ
ئاوازی نوێ چرۆ ئەکا
کێڵگەی وشکهەڵاتووی دڵ
گوڵی ڕەنگاڵەیی ئەگرێ
تەمی سەر ئاوێنەکان ئەسڕێنەوە
تەنیایی لەگەڵ ڕۆحما تێکەڵ ئەبێ...

سوپاس بۆ پاییز
ئای لەو پاییزە ئەزیزەی عومری من
کە وا ئەکا
هەست بە گۆڕانی وەرزەکان نەکەم و
هەرگیز لە خۆیم دەر ناکات
ئاخر ئەوینی من و ئەو پاییزە
ئەبەدییە، ئەبەدیییی...

سوپاس بۆ هیچ
کە هەمیشە لەوسەری گەشتی ماناوە
ئەمهێنێتەوە سەری دێڕ
دێڕی پڕ هیچ...
ئەو هۆشمەندانە هەمیشە دەمهێنێتەوە ناو خۆم و
گەواهی ئەدا
زیندەگی شەرابێکی حەرامە و
سەرابێکی ئاوەدان و
پڕە لە هیچ...

دووبارە سوپاس بۆ تەنیایی
بەم هەموو بێدەنگییە ڕمۆزن و
پەژموردەییەی باران و

هیچێتی ژیانەوە
ئەمگرێتە خۆی و
نایەڵێ سەرم لە سینەی بترازێ
پێی ڕەوا نییە ئەو
چۆڕاوگەی نائومێدی
وشک ببێ و
تەنیایی ئیتر تەنها بێ
پێی هەق نییە
جارێکی تر بشکێنەوە ئاوێنەکان
بباریێ بەسەر ئاسمانی کاڵی کچەکانا
هەوری گومان
ئەو لە منا دروستبووە و
لە مندا درێژە بە حیکایەتە ناکۆتاکانی خۆی ئەدا
لەناو منا
منی تەنیا...



# به‌یانی زوو



سروه شه‌ریف زاده

لایه لایه له‌یلای سروه
مه‌جنوون ئیتر کچه شاعیرێکی کورده
پێده‌شته‌کان
له خه‌تکێشی زه‌ردی شه‌قامه‌کانه‌وه
گه‌لێک جاریش
به به‌رده‌م کافه دێرینییه‌که‌ی شاره‌وه ئه‌بڕێت...
لایه‌لایه له‌یلایه‌که‌م
ئێستاش
باخه‌وانی باخه زه‌رده‌کانتم
من به‌هارم له خۆی
سه‌وزتر ئه‌ویست بۆت و
بۆشاییه‌کان
له‌ناو له‌ته ئاوێنه‌کانی خۆشه‌ویستیدا
بێ مانا!
که زه‌مان به‌پێ و ته‌جره‌به‌ی چیاینی
سوور... سوور بریندارمان

سالی هەشتاوپێنج
دەفتەری بیرەوەرییەکان:
باخچەی ساحلی...
لێوار دەریا...
ئەمڕۆ کۆڵێک قسەی تازەمان بۆ یەک کرد...
هیچ شتێک بەقەد بۆنی دووکەڵی وینستۆن
سەرخۆشم ناکات.
ئەمشەو
والینتاینی پەپوولەی سێزدە ساڵیمەوە
چ ڕووناک حاشایانکرد
مۆمەکان
ئەحیای سەرینەکەم...
بریسکەی ددانەکانی گورگی زۆزانە
ئەوەی دەمی لەگەرمی شەفەقەت کردەوە...
هەڵخستن
لە دەم سنووری هەرهەستێکدا
دارێکیان...
چۆلەکەیەک هێلانەکەی پڕبووە لە ئاو
باران بەلێزمە ئەبارێت...
ئای: مرۆڤەکان
دیوارەکان
داروبەردەکان...



هەر نەیانکرد
ئەوەندەی مشتێک خاک بمێننەوە

لایەلایە من تەمام بوو
شەوانە شیعر بنووسم و
بەیانییان تۆ بیانفرۆشی!
نەک بە مەبەستی چەنێک؟

که حکومەتی نانەو
فەقر درێغی ژین...
بەیانی زوو ئەچم لە نەخۆشخانەی شار
گورچکێکم ئەفرۆشم
ڕەنگە بکرێ
ژوورێک لەنرخی ماڵە گڵینەکان بکڕین و
لە سووچێکیدا
بۆ چۆلەکەیەک.
پەنجەرەیەکی تر دروست بکەم
لەناو پەنجەرەکانیدا
کە ئەوین تیا
شایستەترینی ناوەکانە و
هیوا ڕوانگەی یەکەم...

لایەلایە ئەی پیاوی ڕۆژهەڵاتیم
لێرەوە
دەرگای هیچ یەک لە ژوورەکان دانەخراوە
دەرگا، دەرگا
لە گرێ پووچکە دەرگا ئەتەنینەوە...
لە سبەی
لە هەتاییەت بێگانە نین...
کە بەیانی لەخەو هەستای
بە هەموو ماڵە دراوسێکانەوە
چرایەک ئەبەین و
پێڵاوەکانمان
لە دەریای دەستیاندا غوسڵ ئەدەین...
لێرەوە مرۆڤ یانی
پەپوولەیەک فڕی...
فەقرمینهای نان..
داوێنی خودا و
ئاوەڵ دووانەی دڵی ئێمە

هەتا... تەمەن
پێموایە لانکەیەک بەس بێت.

لایەلایە لەیلای سروە
نەکا شەوانی لەگەڵ ئەوبوون
منی لەیادت بردووە؟
پەنچکێکم نا
تۆ بڵێ دیدەت
بڵێ حەیاتت
بڵێ هەموو جەستەت
بەدوایین دێرم:
تەنیا «ئەرێ»یەک
کە پەنجەرەیەکم نائومێد و...

٢٠٠٧



# سێ هۆنراوە



**ئاوات فەتحی**

## مێژووی تامەزرۆ

**هەزار خۆزگە لە چاوانت بە نیو نیگاوە سەمایان دەکرد**
**بەڵێنی داهاتوویەکی پڕ ترووسکەیان دەدا**
**لەوپەڕی نیگاتەوە هاوارێ راپەڕی**
**سەرنجی خەیاڵی راکێشام بەرەو مێژوو!**
**چرپاندی بە گوێی زەماندا:**
**مێژوو تامەزرۆیە بۆ بیستنی هەواڵێکی سوور!؟**

## خەیاڵ

**هەور، دووکەڵی خەیاڵ و غەمی زەوینە!**
**بارانش فرمێسکی من!**
**شەونم تەمی هەناسەی کێوە لەسەر لاپەڕەی خەیاڵ دەنیشێ**
**بریسکەی نیونیگام، ئاماژەی بۆ رابردووە و بانگ لە داهاتوو دەکا!؟**

شرای و شکارۆی ئینتزار
نامەی هیجرانی دڵدارانە
جا شنەیێک دی
زەوی سووتاوی چاوەڕێی نەختێ فێنک دەکاتەوە

## باغی دڵ

دوێ شەو لە خەومدا
باخی دڵم پڕ بوو لە شیعری زەرد و سوور
باوەش باوەش کۆم دەکردنەوە و
دەمبردن بۆ وڵاتێکی دوور
ماندووی ڕێ بووم
دڵم قورس بوو
ماندوویێتی زۆری بۆ هانیم
لە شووشەی سووچێکی دڵمەوە
بە نیونیگاوە ڕوانیم
بینیم ئەوین ڕەشماڵێکی لەسەر
زەوی دڵم دانا
بووم بە پەپوولە و
هەڵفڕیم و
خۆم کرد بە ژووری ماڵەوەمانا
چاوم بە پەپوولەیەک کەوت
بەناو ماڵەکەدا هەڵدەسووڕا
کە ئەویش چاوی بە من کەوت
هانامان بۆ یەک برد و
باوەشمان بەیەکدا کرد و
خەومان لێ کەوت...!



# سیٚ شیعر



شەرمین وەلی

-١-

## هەستێکی تەڕ

**باران لامەوە**
**دانیشتووە و**
**منیش بە ئەسپایی**
**دەخزێمە باوەشی تەڕییەوە**
**تەواوی لەشم**
**چەشنی کریستاڵ**
**نوقمی ڕۆشناییە**
**ئاسمان تەڕێتی خۆی**
**لە مندا بەتاڵ دەکاتەوە و**
**دەست دەکەم**
**بە سەما...**
**ئای خودا!**

ئیدی من
دەبمە شاژنی مرواری!
بۆ هەمیشە
بۆنی
تۆم لێدێ!

سێپتێمبەری ٢٠١١

-٢-

پێنجشەممە

پێنجشەممەکان دەژمێرم!
پێنجشەممەیەک بۆ بوون
پێنجشەممەیەک
بۆ روانین
پێنجشەممەیەک بۆ یار و
پێنجشەممەیەک بۆ شیعر و
پێنجشەممەیەک بۆ رووتبوونەوە و
پێنجشەممەیەکیش
بۆ خودا...
پێنجشەممەکانم خۆشدەوێ!!
تۆ بڵێی لە پێنجشەممەشدا نەمرم!؟
نا... نا
پێنجشەممەکان جوانن
مردن ناوێرێ توخنیان بکەوێ
مردن لەوە نامۆترە
ویساڵی جوانی بکا
وەلێ!! گەر مردنیش نەبووایە
پێنجشەممەکانمان جوان
نەدەبوون



خۆشمدەوێی پێنجشەممە
تۆ زۆر لە خۆم دەچیت!!!
زۆر...

٢٠١٠/٠٨/١٩ پێنجشەممەیەک



-٣-

## لەوێ مردنیش جوانە!

لێرەوە
دەست پێ دەکەمەوە
لەو شوێنەی
هەموومان ماتین،
هەموومان لە هەمبەر موعجیزەکانا
سەراسیمەین و
بۆ بۆشاییە گەورەکان
بوون پڕ دەکەین لە عەشق
هەر عەشقە
دەتوانێ
لە عەدەمەوە
فەزلی جوانی
بە بوون بسپێرێ،
هەر جوانییە و
ئاسمان دەنەخشێنێ بە رەنگی شین و
دڵە پەژموردەکان
بە باخچە ئاشنا دەکات
ئەمن ئێستا لەوێوە دێمەوە
لەوێوە:

## چیرۆکی باخچە دەگێڕمەوە

لەویا
خودا لە هەموو شتێکدا جوانە
ویساڵی نورانی لە موحیبەت دیارە
هەمیشە عەشقبارانمان دەکا
لەوێ
پاییز چرۆ دەکا
مردنیش جوانە
ئەی خودا
با من هەمیشە لەوێ بم
بۆ ئەبەد

٢٠١٠/٨/١٨



# فڕین بەبێ باڵ

فڕین بەبێ باڵ

فڕین بەبێ باڵ

کەتان خادیمی

بیانووی جووتێک باڵم لە دایکم گرت
وتی تۆ لە نەسڵی منی
دەبێ بە پێی پەتییەوە
بە گشت دونیادا بگەڕێی...
وتم: نامەوێ ملوانکە و بازن و...
باڵم دەوێ پێی بفڕم... باڵ
دایکم بەپێکەنینەوە دەیوت کچم:
وەکو کۆترەماڵییەکانی دراوسێکان
سەربان دوا مەودای فڕینتە
دەموت دایە... باڵم دەوێ
دایکم لەبەر باران هەویری دەشێلا و
بە ژنە دراوسێکەمانی دەوت:
بڕۆیت و نەڕۆیت... هەر لێرەی
ئاخر جانتای سەفەری ئێمە کونکونە...
......



تا دواهەمین سنوور گەشتم
هەموو ئەوکچانەم بینین
کە بە کراسی خۆڵەمێشییەوە وەستابوون
دەگریان و دەیانوت:
هەر هەموو دونیامان تەی کرد
کەچی هەر لێرە خەوتبووین...
لێرە... لەنێو گۆماوی خوێن و فرمێسکا
شارەکان هەر هەموو سوور بوون
دەریاکان سوێر
لەوسەر سنوور هاوڕێیەکم
(عیشق و قاقا و ڕابوردووی خۆی هەڕاج دەکرد)[1]
کچە شاعیرێ
(بەنێو میحنەتی گەلایەکی وەریودا سەفەری دەکرد)[2]
ژنێک بەدیار چەند جانتایەکەوە هەڵتروشکابوو
دەیوت: هیچ قەچاخچییەک
ئەم چیرۆکانەی پێ دەرباز ناکرێن...
من هەر لە سەفەردابووم
ڕێم کەوتە شاری بورکان و
شاری لە بەفرا نوقومبوو
گوندی پڕ لە هاواری ئاوەدانی و
وێرانەی خەوتووی چەندان ساڵە
شەقامی باوەشکردوو بە گەڵای زەرد و
باخاتی دەم بە زەردەخەنەی میوە
سەحرای تینوو و
دەشتی دڵپڕاو بە ڕەنگی سەوز...
تولەڕێی باریک و پێچاوپێچ و نەبڕاوە...
دەمویست بە ڕێی ئەو نەخشە رزیوەی مێشکمدا
بگەمە هەناوی ئەو شارەی لێم ونبووبوو
تەنها چنگێک خۆڵەمێشی لە ڕۆحمدا بەجێمابوو
وێنەیەکی کاڵەوەبووی لەناو زاکیرەما مابوو...
ژنێک بەدواما هاواری دەکرد... دەیوت

هۆو... تۆ... موسافیری یان قەرەج؟
ئەم سەعاتە رزیوانە و
ئەم رۆژگارە ژەنگاوییانە لەتۆ دەکەون....
هەڵم دەگرتنەوە و سوپاسم نەدەکرد
منالێ بەدواما رایدەکرد
دەیوت... دادە... دادە... ئەم وردە شووشانە هی تۆن
لەو جانتایەی شانتەوە هەڵدەوەرن...!
بێنەوەی بزەی بۆ بکەم
دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکەکانم هەڵدەگرتنەوە
لە کۆڵانێکی تاریکی پڕپڕ لە خاشاکی رۆژا
پڕپڕ لە دەرگای داخراو...
دەنگێک غەریبانە دوام کەوتبوو
بانگی کردم
کچێ (شادی)... هۆو... (شۆخان)[٣]
دەستەکانی پڕبوون لە گوڵەی خوێناویی
وتی ئەم گوڵلانە لە تۆ هەڵدەوەرن
گوڵەکانم هەڵگرتنەوە و
وتم... خوایە بۆ لێم نابنەوە
دەنگێکی تر بە هەناسەبڕکێوە
دوای هەنگاوەکانم کەوتبوو
هۆ عاشقە دڵشکاوەکە
(دوعا)... وەرە ئەم جلە خوێناوییانە بەرەوە[٤]
بۆ کوێ دەڕۆیت بیانبە بۆ ئەوێ
باوەشێک جلی زیواڵ زیواڵبووی
ژێر بەردبارانیان خستەوە نێو جانتاکەم
هاوارم کرد دەمەوێت بڕۆم
ئەم جانتایە بەجێبێڵم
هەموو قاقا پێدەکەنین
دایکم وتی سەفەر بێ جانتا ناکرێت
وتم دایە... لێرە رۆژ بە رۆژ
غەریبتر هەنگاو دەنێم...



هەموو ئەو بۆنانەم ونکردوون
کە دەمبەنەوە لای هەناسەی گوڵی تەڕ و دەمی ئاوابوون...
دایە...غ ەریبترم لەو کرێکارەی
کە هیچ لە زمانی ئەم شارە نازانێ
تەنیا خاشاکەکەیان دەبینێ...
من بەدوای ئەو شارەدا وێڵم
کە تەنیا وێنەیەکی ڕەشوسپیم لەلاماوە
دەمەوێت بڕۆمەوە
لە کوچەیەکی (ئەسحابە سپی)دا (حوسنی) بدۆزمەوە(٥)
کراسێکی گوڵگوڵینی لەبەر بکەم
بڵێم حوسنی وەرە تۆ هاوڕێی تەنیاییم بە
من ئێستا زمانی توڕەییەکەی تۆ دەخوێنمەوە...،
دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ حەوشەکەی قوتابخانە و
لەنێو کچۆڵە قردێلە سوورەکاندا...
گسکەکە لە (سوەیل) وەرگرم(٦)
بڵێم وەرە با هەموو قوتابخانەکەت لەگەڵدا گسک بدەم...،
دەمەوێ بڕۆمەوە
لەناو حاوییەکانی شارا
سۆراخێکی (وەهاب ) بکەم(٧)
بڵێم لە کوێی... من ئیدی لە تۆ ناترسم...،
ئێستا دەزانم تۆ
بەدوای چ خوانێکی پاشایانەدا دەگەڕای
شەقام شەقام ڕێگە دەبڕم
کەسێ بە ئاوازی خەمی من مەقام ناچڕێ
ئەمشەو دەچمە لای (فەتانە)و(٨)
گۆرانی (دڵ نەخۆشی دەردی عیشقە) دەڵێین...
فەتانە پێدەکەنێ و دەڵێ:
تاکە ژنی دێیتە نێو دووکەڵی ئەم سیگارەمەوە
دەڵێم فەتانە بڕوانە
لای تۆ دونیا چەند رەنگاوڕەنگە
ئاسمانی لای منیش

**وەک دووکەڵی سیگارەکەت تاریک**
**تەمەنیش وەک گۆرانییەکان کورت و پڕ بۆنی غەریبی...**
**دەنگی کچەکەم رایچڵەکاندم... بانگی کردم**
**دایە جووتێک باڵم دەوێ**
**وتم: تۆ لە نەسڵی منی**
**دەبێ بەپێی پەتییەوە بەناو دونیادا بگەڕێی**
**وتی:**
**من بازن و گوارە و ملوانکەم ناوێت**
**باڵم دەوێت پێی بفڕم... باڵ**
**بە پێکەنینەوە وتم:**
**وەکو کۆترەماڵییەکانی دراوسێکان**
**باڵەکان ئا لەم سەربانە زیاتر دوورت ناخەنەوە**
**وتی: باڵم دەوێت و.... باڵ**
**وتم: سەفەر بەبێ جانتا ناکرێت... نا...**

**هاوینی ٢٠١١**

### پەراوێز:

١- دێڕە شیعرێکی خاتوو سەبا هەڵەبجەیی.

٢- دێڕە شیعرێکی خاتوو رۆژ هەڵەبجەیی.

٣- شادی و شۆخان... ئەو دوو کچەی لە چەمچەماڵ رفێندران و گوللەی جەور نووقمی خوێنی کردن.

٤- ئەو کچە یەزیدییەی بە بلۆکی نەریتی نامرۆڤانە سەری پانکرایەوە...

٥،٦،٧ حوسنی و سوەیل و وەهاب...، سێ لەو مرۆڤانەی شاری سلێمانین کە کەس نەیدەزانی ج جەورێک ئەقڵی لێسەندبوونەوە.

٨- فەتانەی وەلیدیی گۆرانیبێژ...، کە نیوەی تەمەنی خۆی بە بارێکی دەروونیی شێواوە لەنێو ئاگر و دووکەڵی جگەرەدا سووتاند.

# گەڕامەوە

٧



لە ئاورین فەرەیدوون

**سەیرکە**
**من لەوپەڕی نائومێدییەوە**
**لەکوێوە دەگەمەوە بە ژیان؟**
**چۆن هەنگاوەکانم دەمگەیەنێتەوە بە خۆم**
**لەم شاری بێ حوکمەدا،**
**نە ڕۆیشتن دێت و نە مانەوە.**
**من**
**دەمەوێت بڕۆم**
**لەبەر تۆ...**
**بۆ مانەوەمانە لە تەک عەشق**
**بۆ گێڕانەوەی خەونەکانمان**
**بۆ شپرزەیی منداڵیمان**
**بۆ ئەو ئێوارانەی کە پیاسەمان دەکرد بە شاردا.**
**ڕۆیشتنی من...**
**بۆ هێنانەوەی با و بەفرە،**
**بۆ هێنانەوەی دڵێکی تاریک و جێماو**

بۆ هێنانەوەی چۆلەکەیەک... سێوێک...
ڕۆیشتنی من...
لەبەر تۆیە
بۆ ناسینی عەشقە
بۆ بینینی خۆشەویستییە.
ڕۆیشتنی من...
تا ئەوپەڕی تەنهایییە
تا گەیشتن بە تۆ.
ڕۆیشتم...
پرسیار مەکە بۆ دۆزینەوەم
لە ماڵی رووحمدا،
هەناسەیەکی پڕ لە عیشقم جێهێشتووە
ئێوارانێک چاوەڕوانی گەڕانەوەتە
تا بە خۆت و
منداڵە یەک مانگانەکەمانەوە بێیتەوە
بۆ نێو ماڵی شیعر.



که ڕۆیشتم قەفەزی نیگەرانیمان دەبەم
ئیدی لەو سەحرای ئەنفالەدا
جێی دەهێڵم...
جێی دەهێڵم بۆ گورگەکانی نیوەشەو
بۆ دەرگا داخراوەکان
بۆ سەفەرە ڕەشپۆشەکان



نەغمەی بوولبوولێکی تەڕبووی بەر باران.
ڕۆیشتم...
پاش خۆم بەهارێکت بۆ بەجێدەهێڵم،
کاغەزێک بۆ نووسینەوەی ڕۆژەکانی بێ منی
گوڵێک لەناو پەرداخی ئاو...
پەرداخێ لەسەر لێواری پەنجەرەی ماڵە رووخاوەکەم داماوە
کەناریيەک تا بەیانیان وەک من بەئاگات بهێنێت.
چڵە نێرگزێک
پاساریيەک...

دێڕەنووسینێک
وێنەیەکی خۆم...
دەنگێکی تۆمارکراو.
ڕۆیشتم...
تۆ ئاگات لە خۆت بێت
لە ڕۆحی رووخاوی من
لە ئاوێنەی ژووری چاوەڕوانیمان
لە شووشەی پەنجەرەکان لە دەرگاکان
لە هەتاوی نیوەڕوان لە تەنهایی شەوان
لە پشیلەی حەوشەکە
لە سێبەری دارهەنارەکان...
ئاگات لەخۆت بێ تا من دێمەوە،
کەم بنووسە و کەم بخوێنە لەبەر من
ئاخر نامەوێت
کە هاتمەوە لەبەر کزیی چاوت
رووخساری زەرد و شێواوم نەبینی...
لەبەر من بمێنەوە لە ماڵ
ئاخر رۆحی من منداڵە
لاسارە... سەرەڕۆیە...
فێری تەنهاییە!
لەبەر من...
رۆشنایی خۆر کۆبکەوە
لە تاقی تاریکیم بۆم دانێ
لەگەڵم بفڕە بۆ سرووشتی ژیان
لەگەڵمبە بۆ نزای ئاسکێک لە دەربازبوون،
بۆ ماسییەک لە وشکانی
بۆ بۆقێک...
سفرەیەکی بێ نان
کانییەک...
بۆ پیرێکی نەخۆشی سەر جێگا
بۆ بەرماڵێکی جێماو





بۆ سووتانی دارتوویەک
سەگێکی برسی
کۆترێکی پێکراو!
نزا بکە...
بۆ هەورێکی گریاو
بۆ رووخانی لادێیەکی بچکۆلە
نزا دەکەین...
بۆ کیژێک لە چاوەڕوانی سەفەردا
سەیرکە...
کە گەڕامەوە
هەزار و یەک وشەت بە دیاریی بۆ دێنم...
وشەی پێکەوەبوون، مانەوە.
تەزبیحی (لا الەالا اللە)
تورەکەیەک خۆشبەختی
خەندەیەکی کوێر
پێکەنینێکی لاڵ
بارانێکی بەلێزمە.
دێمەوە بۆ نێو ماڵی بێدەنگیمان
دێمەوە پێکەوە خۆمان دەنووسینەوە،
باخەکەی نێو ماڵەکەمان سەوز دەکەینەوە
پێکەوە رووناکی هەڵدەکەین...
ترسی رووحمان دەشکێنین
عەشقمان لە پەرداخێ خوێن پڕ دەکەین و
هێدی هێدی دەیخۆینەوە!
یاسای شەرم... گوناە...
دەکەینە نامەیەک و بە پۆست دەینێرین بۆ دۆزەخ.
هاتمەوە...
پێڵاوەکانمان فڕێ دەدەین
بەپێخاوسی رادەکەین
خانوویەک لە قوڕ دروست دەکەین...
شار بەجێ دەهێڵین و

شێرەبەفرینەیەک لە عیشق دروست دەکەین
هاتمەوە...
دەفڕین بەرەو بەرزایی بەرەو ئاسمانی شین...
بە یادی (لەژێر ئاسمانی شینا، لەپاڵ لوتکەی بەفرینا)
دەمێنینەوە لەگەڵ نەغمە و شیعر
وەک لاولاو
تێکەڵ دەبین.
هاتمەوە...
دەڕۆینە گەشتێکی دوور...
خۆمان بە رابردوومان دەناسێنینەوە
دوور دوور دەڕۆین...
تا دەگەینە فێنکی هاوینێک،
گەرمی زستانێک،
لقی شۆڕەبییەک.
ئەم شارە بەجێ دەهێڵین
بۆ قەلەڕەشەکان...
بۆ سۆزانییەکان...
بۆ رەبەنە پیرەکان...
بۆ منارەی مزگەوتەکان.
هاتمەوە...
بۆت دەگێڕمەوە
گوناە چۆن تێکەڵی ژیانی کردووم،
منیش لەو غەریبیە
تا
گەیشتم بە تۆ و تۆم دۆزییەوە
چۆن نیگەرانیی تاقەتی لێبڕیم...!
چۆن بە تاقی تەنها
خۆم بە هەموو دوکانێکی گوڵفرۆشدا دەکرد،
چۆن لە هەموو چێشتخانەیەک لام دەدا...
چۆن سڵاوم لە هەموو چایخانەیەک دەکرد،
سەرم لە سەرتاشخانەکانی شار دەداو





به خۆم دەوت:
ئەو لەم سوچە... نا لەو سوچە...
یان لەم پارکە...
رەنگە لەم کتێبخانەیە بێ!
دەگەڕام دەگەڕام
خەڵکم دەبینی
دەمپرسی بانگم دەکرد...
تۆ دیار نەبووی!
لێم ون بوویت...
دەترسام
تۆ سەفەرت کردبێت
رۆیشتبی رۆیشتبی بۆ ناسینی کیژۆڵەیەک
بۆ ماڵێکی قەیرەیی
لە کەنار مەرگ!
ترسام مەرگ رێگای لێگرتبی...
تۆش بە خۆت و چارەنووسی منەوە
خۆت تەسلیم کردبێت و لەگەڵی رۆشتبی!
لەبەر ئازار خۆت بخنکێنی
ترسام تۆ من نەدۆزیتەوە...
منت بیرچووبێتەوە و
رۆشتبی بۆ سەردانی عەشقێکی تر،
بۆ دۆڵێکی تەنگ
بۆ ناسینی دارچنارێک
بڕیارت دابێت من لەبیرکەی!
نیشتمان ئاوابکەی...
(خوایە وەتەن ئاواکەی چەن دڵگیر و شیرینە)
سەفەر بۆ رۆحێکی تۆقیو بکەی!
ترسام تووشی خەمباران بیت و
من نەدۆزیتەوە
منیش تۆ نەدۆزمەوە.
سەیرکە...

ئێستا،
لەم هەموو ترس و گومانەدا
لەم رۆشتن و جێمانەدا
لەم تەنهایی و نیگەرانییەدا.
سەیرکە...
یەکمان بینییەوە و
تۆ قیبلەت رووە و من، منیش نزام رووە و تۆ
تۆ هاتییەوە و منیش هاتمەوە،
تۆ هەر خۆت و منیش هەر خۆم
تۆ شاعیر و من شیعر
تۆ گۆرانی و من ئاواز
تۆ شوان و من شمشاڵ
تۆ رێبوار و من تێشویەک نان.
هاتینەوە...
بۆ پێکەوەبوون و
بۆ دەسپێکردنەوە و
بۆ ماڵە تۆز لێنیشتووەکەمان.
خوێندنەوەی نامەکانمان
بۆ ئاشکراکردنی حەقیقەت!
گێڕانەوەی خەونە حەسرەتییەکان.
هاتینەوە...
شەڕ بوەستێنین و
شەڕی خوێناویی دەنکە هەنارەکان،
رەقی قۆخە تفتەکان کاڵ بکەینەوە
دوو منداڵ ئاشنا بکەین بە یەک.
گوڵەکان تێکەڵ هەنگە زەردەکان بکەین و
خۆشمان
تێکەڵ بە یەک بین تا ئەبەدییەت...
ئێستا،
سەیرکە
ئەشقمان چۆن ئەمان چۆڕێنێتەوە ناو ژیان،



چۆن وەک جۆگە و رووبار تێکەڵمان دەکات.
سەیرکە ئێستا کە هەردووکمان هەین
بۆ بەرەو حەقیقەتی ژیان رێگا نەکەین.

٢٠١٢/١/٤



# کە دڵ لێواولێوە لە هیچ



رووناک ئەمین

-١-

دڵ کە لە خۆشەویستی خاڵی
لە ژیان خاڵیترە
من کە لە تۆ خاڵی
لە خۆم خاڵیتر
شەو کە لە خەو خاڵی
لە خەیاڵ خاڵیتر
مانگ کە لە چواردە خاڵی
لە پرشنگ خاڵیتر
ساڵ کە لە بەهار خاڵی
لە وەرزەکان خاڵیتر

ئەستێرە کە لە جریوە خاڵی
لە ڕووناکی خاڵیتر
سەوزایی کە لە باران خاڵی
لە دەریا خاڵیتر
پەری چوون لە خەم خاڵی
لە نەمان خاڵیتر
لەم فەزا خاڵییەوە
ئیتر چۆن گوزەرکەین
وەک باڵۆنێ بەدەم باوە
یا وەک پەپوولە پاییزەیەک
ئاخۆ سەر لە کوێ دەرکەین



-٢-

هاوکێشەیەکی سەختە
گەر مرۆڤێ شیکەیتەوە
دەستلەملانێیەکی ناوەخت بوو
گەر پێوانەی بۆ بکرێ
خاڵی لەیەکچوون زۆر کەمە
لە دابەزینی بەردەوامە
لە کەوانەیەکی داخراو
دوو کەس کۆناکرێتەوە
پێ پلیکەکانەی ژیان
لە یەک دوور لە یەک پچڕاو
جەمسەرەکانی هۆش و هەست و جوڵە
ناگەن بە یەک لە یەک دابڕاو
دڵ و خۆشەویستی چەنەها پارچەیە
چەسپێکی وا نییە بەیەکەوەی بلکێنێ
گەر لە دەستکردی مرۆڤ خۆی بێ
پێ دەچێ ژیان و مردن هاوبەهابن
تترووسکەی مۆمی داگیرساو

یا بۆنی بەهار و نێرگزە جاڕ
ئەبێ چ... ڕۆڵێ ببینێ
یا کوا... ئیتر...؟
ئەبێ... چی بێ...؟
بزوێنەری هەنگاوەکان
کە ئێستاکە دڵ لێواو... لێوە لە هیچ

سوید
تەمموزی ٢٠١١



**چیرۆک**

# نهێنی گوڵە ناتەواوەکانی ڕەعنا



**چنوور سەعیدی**

ئەبینم، بەڵام لە مانای وشەکان تێ ناگەم، ئەشبینم کە ئەڤیرۆس شووشەی مووروو و زەنگیانەکانم هەڵئەگرێ و بە نقەنق ئەیباتە سەر پلیکانەکان، تا بیداتە مەولانا کە بە حیساب زۆری هەیە و بیکاتەوە، بەڵام لەم ناوە ناوە ئەڤیسینا لە دەستی ئەیڕفێنێ و لێی ئەکەوێ و ناو حەوش و دەروبان پڕ ئەبێ لە زەنگیانەی ڕەنگامە، بەڵام دڵم ڕاناچڵەکێ.

ژنەکانی دراوسێ، دەستە دەستە دێن، دەمووچاویان پڕە لە بەزەیی و حەپەسان و لێویان ئەبزوێتەوە، تەنیا گوێم لە دەنگی خەسوومە:

- جنۆکەی بینیوە و منداڵەکەی لەبار چووە.

حاجی دوعای ترسم پێدا ئەخوێنێ و فووم لێ ئەکا. گەرمی هەناسەی دڵم خاو ئەکاتەوە، هەست ئەکەم بۆنی شەرابی لێدێ، دڵم تێکەڵ ئەبێ، چاوم لێیە کاکە برا بە جگەرەکەی دەستییەوە، تەنیا بۆ چەند چرکە دێتە خوارەوە و سەردانم ئەکا، یاخوا دیسان سووتووی جگەرەکەی نەکەوێتە سەر فەرشەکە، لێوی بە ئاستەم ئەجووڵێتەوە، گرینگ نییە ئیتر خەمی پێوە ناخۆم، بێگومان ئەڵێ: ئەگەر ژن چاکیان بوایە... چاوم لێیە سەری مەنجەڵەکە هەڵ ئەگرێ و تامی چێشتی دەستی ژنە دراوسێیەکان ئەکا و بە رووگرژییەوە ئەچێتەوە ژوورەکەی.

- ڕەعنا! تۆ بڵێی کاتی خۆی کام لەم ژنگەلە دەسماڵ حەریری ئەسمەر

بووبێتن؟ دەسماڵ حەریری ئەسمەر، مێردت کرد خاکم بەسەر. ئەی ئامینێم تاقانەی دایە کامەیانە؟

ئاوی سارد و چا ئەگێڕم، هەم بە دوای تاقانەی زیرەکدا ئەگەڕێم و هەم ئاگام لەو پوولەک و زەنگیانەگەلەیە وا لەم گەرماوگەرمی زکرەدا لە کراس و پشتێنی پیرەژنەکان دائەکەوێ و لە دواییدا بە وردی کۆیان ئەکەمەوە.

- پێم وایە کافیە خانم بێ!

- چووزانی هەر لەخۆوە؟!!

- چونکە هەمیشە بۆنی شامپۆ و سابوونی لێدێ، هەست ئەکەم تازە لە حەمام هاتووەتە دەر.

خاڵێکی بەقوەت لە زیرەک ئەوەیە کە هێزی تەسەوری لاوازە؛ چون لەجیاتی ئەوە سێشەممانە کاروباری تێک بدا، ئەتوانێ چاخانەکەی بسپێرێتە دەستی شاگردەکەی و کورسییەک بەرامبەری شەقام دانێ و گۆرانییەکی حەسەن زیرەک سەر بخات و قلیانێکی سێو یا نەعنایی بۆ خۆی ساز بکات و بە ئیشتیا سەیری ئەو کچە گەنجانە بکا وا لەبەر چاخانەدا تێئەپەڕن و ئینجا تەسەور بکا ئەگەر قەڵەو ببواین و بە کراس و دەسماڵی کوردی و سووراو و سپیاوی دەموچاویانەوە لەجیاتی زانکۆ و دایرە بە لارولەنجەیەکی زیرەک کوژەوە بچووبان بۆ سەر کانی، ڕێک ئەبوو بە جەوی گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک.

ئەو کاتە خولیای تۆم نەبوو، بۆیە زۆری خایاند تا بڕوام بە عەشقی بابە بەو پیرەژنانە کرد، تا سەرخۆشییەکانیم بۆ هاتنی سێشەممە و داخستنی دووکان هەر لە نیوەڕۆدا دەرک کرد. تا ئەڤیسیناشم لەدایک بوو، جاروبار ئەمپرسی:

- تاقانەی تۆ کێیە؟ پێت خۆش بوو منیش سابلاغی بوایەم و ناویشم مریەمێ بوایە؟

نە ئیتر بەخێڵی نابەم چۆن ئەزانم هەر زکرێکیان مووروو یا زەنگیانەیەکیان دائەخا کە تەواوکەری گوڵەکانتە گوڵەکەم.

بڕوانە ئەمەیانت بەدڵە؟ وێنەی ئەم گوڵەم لەسەر پشتێن و کراسی کەس نەبینیوە، باوەڕ بکە تۆ یەکەم کەسی شتی وا لەبەر ئەکەی.

خۆشترین کاتی سێشەممە، کاتی ماڵئاواییە، تا هەستن دەستی حاجی ماچ بکەن، کراس و پشتێنیان لە ژێری یەکتردا گیر ئەخوا و هەر موورویە کە ئەڕژێ...

بابەت سێشەممانە ریش و سمێلی لێ ئەتاشێ و لەبەر هەیواندا لەسەر جوولانەی کوڕەکان دائەنیشێ و لەدەموچاوی چرچ و دەستە پیرەکانیاندا بەدوای ژنی ناو گۆرانییەکان ئەگەڕێ... هاهاها.

- وەک قومری سەر باڵم شینە. ئەی خودا نەدەبوا بە جێگەی باوکم من هاوڕێی ببوایەم؟ یا قیبلە ئەترازا ئەگەر کوڕی بوایەم و ئەو دەنگە خەمینەیم بە میرات پێگەیشتبایە؟

- ئیتر ئەبوا بەردەوام دڵەڕاوکەی هەوێ بەسەر هێنانم بوایە و ئەو قسانەی حاجی بۆ خەڵکی ئەکا بۆ منیش ئەبێ بە ڕاست!

- دەی جا چی لە تۆ کەمئەبێتەوە؟ چاوم بە چاوە کاڵەکەت، لێوم لە لێوە ئاڵەکەت، ئامان کەڕێ و دەخیل کەڕێ...

تۆ توورە مەبە کچم هەمووی فشەیە، من بابە باشتر لە تۆ ئەناسم، زیرەک پیاوی ژنهێنان بوایە، پێنجشەممانە تا نیوەشە و لە چاخانەدا نەئەمایەوە. نە لەبەر ئەوەی قەرەباڵغە نە.

بزانە ئەگەر ناو ئەو گوڵە هەمووی بە پوولەک پڕ بکەمەوە، جوانە یا موورروو؟ پوولەک؟ باشە با بە دڵی تۆ بێ، با هەموو پەڕەکانی چێرەیی بێ، ئەو ژنانە وا بە سەیارەی ئاخرین مۆدێلەوە دێن تا حاجی دوعایان لێ بکا، تا بزانن کەنگێ خانووێک بە ناویانەوە ئەکرێ و چی بکەن تا لەبەر چاوی مێرد و خەزوورانداخۆ شیرین بکەن، هیچیان شێوەی مریەمە چاوجوان و کەتانەی ئەمینێ و شیرین شەمامەیان پێوە نییە. زیرەک ئەڵێ:- رەعنا! هەست ئەکەم پێستیان لە ژێر ئەو هەموو ئارایش و کریمەوە رزیوە.

مەکە کوڕم، واز لەو دەرزییە بێنە، بچۆ بزانە دایە حاجی چی ئەکا؟ حاجی بەوەی جوان بێ بڕیاری شووکردن بە کوڕێکی دەوڵەمەند ئەدا. وەڵا من قەد قەد داوام نەکردووە کتێبم بۆ بگرێتەوە! بابە؟ بابەش وەک کاکە برا هەر بەم رۆژگارە دەمەقرەیەتی ئەڵێ:

- حاجی تۆ خودا بەستە ئیتر، بە شەرەفم ئەگەر ئەفیرۆسیش زمان بکاتەوە ئەتوانێ چیرۆکێ بۆ ئەو وێنانەی ناو پەرداخە قاوەکان ساز بکات. کەم کڵاو سەر خەڵک بکە حەیامان ئەچێ!

حاجی ئەڵێ:- ئەگەر بکەومە ناو جێگە کێ بەخێوم ئەکا؟ تۆ یا ژنەکەت یا کاکە تەڕەماش و فیلەسووفە خوێڕییەکانی؟!

وەڵڵا قسەی خۆمان بێ کاکە برا کاری چاک ئەکا وا خۆی تێکەڵ ناکا. ئەوەتا... بەقوربانت بم باشە؟ ئێستا ئیتر ئەم پشتێنەش تەواو بوو. ئەبێ بۆ کراسێکی رەش یا... راوەستە بزانم بۆ چێرەیش ئەبێ؟ ئەرێ ئەبێ، چۆن گوڵی سوور بۆ هەردوویان جوانە.

تەنانەت لەسەر سفرەوە لەگەڵماندا نان ناخوا ئەزانێ سەبارەت بەو ئایەت

و وێنەی شێخ و بەیاخ و تەزبێح و بەزم و رەزمەی حاجی وا بەدار و دیواردا هەڵیواسیون ئەبێ بە دەمەقرەیان، چاوت لە حاجی نییە چلۆن هاوار ئەکات:- تۆ توخمی جنۆکەی! خودا ژنەکەت روو رەش بکات وا تۆی کرد بە کافر! من، حاجی ئایشێ، موریدی شێخ کەسنەزانی گەورە، نازانم چ تاوانێکم کرد وا خودا توخمی تۆی کافری لە مندا چاند!

ئەگەر بابە بە جێگەی کاکە برا بوایە پێی ئەگوت: خەتای باوکمە نەخودا! بەلام هەر ئەڵێ: ئیتر سەردەمی سیحر و کۆنەپەرستی بەسەر چووە سەردەمی عەقڵییەتە، کە حاجی ئەڵێ:

- ئەی شیرڕڕ!!، کاکە نانەکەی لە نیوەدا بەجێ ئەهێڵێ و براکانت تا چەند رۆژ هەر... پێئەکەنن!

- زیرەک، خۆزگە هەر لە نۆ ساڵەیدا مێردم پێت کردایە ئەزانی بۆ؟

- هەتیو خۆ من منداڵباز نیم!

- تۆ بڵێ بۆ؟ ئەو کات کاکە برا ئایینی بوو وانییە؟ ئیتر ئەم ناوە ئەنتیکانەی بەسەر کوڕەکاندا نەئەسەپاند.

- ئەوە خراپتر بوو، چۆن ئەو کات ئاینییەکی تۆخ بوو، ناوی دەنان ئەبووبەکر، نەخێر عبدالمطلب! ئینجا چیت پێئەکرا؟ باشتر لە ئایینەوە بازی داپووە سەر عیرفان! رەعنا تۆ بڵێی ئەمجارە چ ناوێ بەسەر کچەکەماندا بسەپێنێ؟

- خەمت نەبێ شوکر ئیتر دەستی بە ئەم ناگا.

- تۆ چووزانی هەر لە خۆوە؟

کچم راستە بابە هیچ لە فەلسەفە نازانێ، بەلام کاتێ ببێ بە شەڕمان و زمانی تاڵ بێ ئەم قسەیەی کاکە برام بەناو چاودا ئەکوتێتەوە:

- ئەگەر ژن چاکیان بوایە فیلەسووفێکیان تێدا هەڵئەکەوت!

بۆیە تەنیا ئەڵێم:- کاکە برا تاقەتی لە ناوی کچانە نییە.

چیتە کچم؟ بۆ بێتاقەتی؟ چیم خواردووە نەزگەرە ئەکەی؟ بڕوا بکە هیچم بۆ ناخورێ، لە هەموو شتێ بێزم دێتەوە، لە ئاویش، ئەم پیرەژنانە کە سێشەممە دێن تا پێنجشەممە ناڕۆنەوە، ئەبێ بەشێک لە حیکمەتەکانی حاجی ببینن و بزانن خودا هێز و حیکمەتی دوعا و نووشتە بە هەموو کەس نادا!

تا پێش ئەو نیوەڕۆیە هاوینە هەر خولیای تۆم نەبوو، ئەمزانی ئەگەر کچێکم ببێ، نە ئەتوانم بە دڵی خۆم ناوی بۆ هەڵبژێرم و نە پەروەردەی بکەم. لێم زیز مەبە، تۆ کاکە برا ناناسی. ئەو نیوەڕۆیە وا لە سۆهرەوەرددا دووگیان بووم یەک جار خوێم بە چێشتەکەدا کرد، تا شەراب و مەزەم لەو پلیکانە ئاسنینەوە بردە

سەر کە بیکەنە قوزولقورتیان، لە بیرم چوو و جارێکی تر خوێم بێدا کردەوە. هەر لە کەوچکی یەکەمدا هاواری بەرز ببووەوە و مەنجەڵەکەی فڕێدایە نێو زبڵدانەکەوە...

قسەی زۆری کرد، بەڵام هەر ئەوەم لە بیرە کە گوتی:- ئەگەر ژن چاکیان هەبایە فیلەسووفێکیان تێدا هەڵئەکەوت. نە گوڵم ئەو قسەیەی تەنیا لە تووڕەییدا نەگوت چۆن هەرکات وێنەکانی خۆی و ژنەکەی تماشا ئەکا ئەمە ئەڵێتەوە. ها؟ دەمێکە لە یەک جیابوونەتەوە، لە وەتەی تەلاقی وەرگرت ریش و سمێڵی لێتاشی و وتی لەمەو بەدوا من فیلەسووفێکم!

کوڕم مەولانا ژێر ئەو چێشتە خامۆش بکە با نەڕوا.

چێم بۆ ئەگوتی؟ ئەها... هەر کە وای گوت، هەستێکی خۆش لە دڵما باڵای کرد، ئەو کاتە پڕ بە دڵ ئارەزووم کرد، سۆهرەوەرد کچ ببوایە.

ئەو حەزە هەر مایەوە، نە سۆهرەوەر و نە ئەڤیسینا و نە ئەڤیرۆس... بەخودا، بە چاوی تۆ درۆ ناکەم هەر بە خۆشی تۆوەوە ئەوانیشم بوو، کەچی ئێستا بە ژنەکانی تەکیە بەس گوتوومە کچ ئەبێ بە گۆچانی دەستم.

دەی هەر وایە، وانییە؟ بڵێی وا نەبێ؟ من باسی ئەم پشتێن و کراسانەم بۆ کەس نەکردووە، ئای کە حەزم لە هەنارە... جا بە ئیشتیا سوێری بکەی، تۆزی سماق و ئاولیمۆی پێدا بکەی ویش ش ش...

- کەی دانیشین دوو بە دوو، کەڵەگەت و خاڵ لە روو، مەمکت خڕ کرد وەک هۆڵوو.

- مەبەستت خاڵەکەی لای لێومە؟ دەمێکە لەبیرت نەماوە، تەنانەت خۆمیش.

- نە شەمامە! بەیتی ئەوەڵ و سێهەمی ئەڵێم.

باشتر، باشتر کە چاوەکانت نوقاندووە و ئەم چاوە پڕ لە نیاز و پاڕانەوەی باوکت نابینی، بە گیانی تۆ کە ئیتر لە هەموو کەس بۆم گرینگترە، ئەگەر ئێستا چەند ساڵی پێش بوایە و چاوەڕێی تۆ نەبوایەم، ئەگەر ئەم گوڵانەم دروست نەکردایە وا رەنگ و شێوەیانم لەسەر کراس و پشتێنی کەس نەبینیوە، ئەگەر چاوەڕێی سێشەممانە نەبوایەم با بزانی چیم ئەکرد. بێگومان یەک لەم دوو کارەم هەڵئەبژارد.

- رەعنا ئەو چایە بوو بەچی؟

- راوەستە حاجی خانم با ئاوەکە گەرم بێ تازە سەرم خست.

یەک: یا چـاوەڕێ ئەبووم حاجی و براکانت بخەون و ئینجا ئەچوومە ژوورەکـەوە و خۆم ئەکرد بە ژنێکی بێگیان و تا تەواو ئەبوو بیرم لەوە

ئەکردەوە بۆ بەیانی چی لێبنێم و چلۆن ئاوی گۆشت بە دزی کاکە براوە بکەمە ناو بەشەکەی و پێم نەزانێ و نەیکاتە قڕە! ئاخر چۆن ئەبێ کەسێ بەردەوام بخوێنێتەوە و ویتامینی گۆشت نەگاتە لەشی؟

تۆ بڵێی ئەو پیرەژنانە وا بابە بە عەشقیانەوە و هەموو جار بە ئەوپەڕی ئیشتیاق و تامەزرۆیی و بە بیانووی پلیکانی زۆرەوە دەستیان ئەگرێ و دایەگیان دایەگیان ئەیانهێنێتە سەر، لەو کاتانەدا زیندوو بوون یا مردوو؟ ئایا ئەو کاتەش حەسەن زیرەک هەر هەست بە مردوویی یا زیندوویی دڵدارەکانی ئەکرد؟ یا هەر ئەیویست وەک بابە تەواو بێ و بخەوێ.

- بوەستە با دوایین دەوری چا ببەم بۆ پیرەژنەکان.

- تۆ بڵێی بۆچی هەروەک منداڵ لەسەر ئەو فەرش و پلیکانگەلە گاوڵکێ ئەکا و موورروو و زەنگیانە کۆ ئەکاتەوە؟

- بێگومان خەریکە بەو وردە قوماش و کراسانەی وا حەزم لە ڕەنگ و جنسیان نییە و پی ئەدەم کە بە خەڵکی هەژاری ببەخشێ، شتێک دروست ئەکا و نایدرکێنێ.

گوێت لێیە کچم؟ جا بۆ بیدرکێنم؟ هەر پێشی ناڵێم تۆ کچی با لە داخانا بتەقێ!!

- شتێک دروست ئەکا و ئەیفرۆشێ، جا خوا نەکا بووک دەستی بچێتە گیرفانی خۆی، ئیتر خودای خۆی بە حەق ناناسێ! ئەبێ زۆر ئاگات لە موورروو و زەنگیانەکانت بێ حاجی خانم!

- ئا... ئا هەروا ئەکەم، تەنانەت کاتێ میوانمان نییە بە جێگەی ئەوە تەزبیحات بکەم، موورووی سەر جلوبەرگەکانم ئەژمێرمەوە. ئەو کاتەش وا دەف ئەژەنم و هەست ئەکەم لە بیابانێکی عەرەبستاندا بەپێی پەتی بە دوای ماڵی پێغەمبەری نازدار...

- صلی علی محمد و اله محمد.

- بەدوای ماڵیدا ئەگەڕێم و زارم وشک ئەبێ و دەف ئەژەنم، خەمت نەبێ، هەر بەو حاڵەش ئاگام لە پوولەکەکانمە لێم نەکەوێ.

- نامدوێنی بۆچی نامدوێنی؟ بۆ لێم زیز بووی نامدوێنی؟

- ئەم ڕۆژانە زۆر باش نیم زیرەک، هەموو جار کە ئەجووڵێتەوە هەزار جار ئەمرم و زیندوو ئەبمەوە، نە بە شەودا خەوم هەیە و نە بە ڕۆژدا ئیسترا‌حەت، ناشوکری نەبێ زۆر بزۆزە!

لە کوێ بووین؟ ئەها هاتەوە بیرم، ڕێگای دووەم ئەوە بوو کە -تۆش هەر کچی- خۆم ئەکردە نەخۆش و تا هەفتەیەک سەیری گۆرانیوتنەکانیم ئەکرد،

گۆرانییەک کە من لە مەبەستی تێبگەینێ و من هەر خۆم لێ گێل ئەکرد و ئەویش حەزی پێ ئەکرد! نازانی چەند خۆشە یەک هەفتەی تەواو سەیری تامەزرۆیی و پلەزیقانی بکەی! لەو کاتانەدا هەست ئەکەم حەڤدە سالی پێشە و تازە یەکترمان ناسیوە، بە توون و تەوەس با نیوەشەوانەش هەر لە تەنیشتما نەخەوێ.

–ئۆف... چەتیو مەکە، گیانم دەرچوو... زیرەک تکایە من ناتوانم ئەو پەرداخانە بشۆ. –جارێ... باشە... –ئاخر کەنگێ؟ دوای یارییەکەی مەنچستێر...

ئەو یەک هەفتەیە بە خۆم ئەڵێم:

بڕوا رەعنا ئێستا دەرفەتێکی باشە تا پڕ بە پێستت هەست بکەی تۆ هەمان مریەمە چاوجوان و کەتانەی ئەمینێ و پشتێن شل و ملی، بڕوا ئەم گۆرانیگەلە ئەم تامەزرۆیی و پلەزیقانە بۆ تۆیە تەنیا بۆ تۆ رەعنا.

بە چاوی تۆ گوڵم ئیتر هیچی ئەمانە بۆم گرینگ نییە و هیچ لەم کارگەلە ناکەم، ئەتوانم تا پیر ئەبم هەر ژنێکی مردوو بم و بۆم گرینگ نەبێ بابە هەست بە مردوویی یا زیندوویی یا خاڵەکەی لا لێوم بکا یا نەکا، یەعنی تۆ نازانی بۆ؟ چەتیوەی هاروهاجە وا مەکە لە خۆت! دیارە وەک منداڵەکانی خۆم وای، کاتێ پێئەکەنی گۆنا ناسکەکانت دوو چاڵی بچووکی تێئەکەوێ و سوور هەڵئەگەڕێ.

رەنگە هێندە بزێو بی هەموو کوڕەکانی گەڕەک و براکانیشت بە دەستەوە یاس و هەراسان بن. ئەی بە قوربانت بم باشە؟ دەبڵێ باش.

– رەعنا بەیانی شەو میوانم بۆ دێ، پازدە کەسین و لەسەر «ئەخلاقی کانت» قسە ئەکەین. گۆشتی شەکمان بۆ لێنێ.

تکایە، تۆ خودا مەکە... وەرە بە حەوت مانگە لەدایک بە، ئیتر تاقەتم نەماوە، بێزم دێتەوە سەیری خۆم بکەم، دەمولووتت بۆ ماساندووم، خۆزگە تۆ جێگەی مەولانا ببوای و دەفرەکانت بۆ بشۆشتبام. ئاخ... خودایا ئەبێ مەزەشیان بۆ دروست بکەم.

جلەکانم نەشۆردووە، لەبیرم نەبوو بە باوکت بڵێم ماشێنی جلشۆرییەکە دوێنێ خراپ بوو. بەم زووانە چاکی ناکاتەوە و ئەبێ هەر خۆم بیشۆم. نا... جارێ تەواوم نەکردوون، پوولەکەم پێ نەماوە، هەمووی زەنگیانەیە، ئەمەوێ هەمووی یەک دەست بێ ئەبێ وا بێ، پێم وتی ئەو گوڵانە خۆم ئەکێشم بە گیانی تۆ لە هیچ جێگایەک نەمبینیوە، کچم بیانوو مەگرە ناتوانم بڕۆم بۆ بازاڕ، ئاخر ماڵت ئاوابێ چلۆن بڕۆم؟ ئەم پیرە سەگانەی دەوروبەری حاجی سێشەممە دێن تا پێنجشەممە، براکانت هەمیشە یا برسییانە، یا پێکەوە شەڕیانە و حاجی تاقەتی هەرا هەرای نییە، هیچیان وەکو یەک نان و چا ناخۆن، هەر من زەوقی خواردنیان ئەناسم.

- لەبیرت بێ لەو قارچ و پیوازە خۆشەش بۆ من ساز بکە.

- بەسەر چاو کاکە برا.

تەنیا دوو گوڵت ماوە، قەراغەکەی تەواو بوون، دوێنێ تەواوم کردن، نە... چۆن دڵم دێ کارت پێ بکەم. تۆ ئەبێ ئێستا لە خەوی شیریندا بی و من جلەکانت بۆ ئوتوو بکەم و کتێبە هەڵڕژاوەکانت کۆ بکەمەوە و ئەوانەی بەیانی لە جانتاکەت دانێم. یاخودا داوەشێی زیرەک پێم گوتی هەنار و پرتەقاڵم بۆ بێنەوە، ترش‌ش‌ش... ویش‌ش کە خۆشە، بۆ نیمانە؟ ئەوەتا تۆزێ سماق بخۆ، ئەها ترشە... ئەزانم بەخوا بەیانی خۆم بۆت ئەکرم. خۆزگە بۆگەنی ئەم زبڵانە بیهێشتایە هەر ئێستا بە دەستی کەفاوییەوە، راکشێم و تا بەیانی هەڵنەستم، نا ناکرێ بۆگەنی ئەمانکوژێ، من خەمی تۆمە.

ئەوە بۆ نزگەرە ئەکەی؟ ئامان نەکەی بترسی! عەیب و شوورەیی! من؟ ئا، بەڵام با کەس نەزانێ، تاریکی ترسێنەرە، نییە؟ هەمیشە هەست ئەکەم، جنۆکەیەک، پشیلەیەک، پیاوێک... چووزانم، پەندێکم بەسەر دێنن... ئەمە خەیاڵی منە، بەڵام راست نییە، ئێرە هەر ئەو کۆڵانەیە وا هەموو رۆژێ تێیدا هاتوچۆ ئەکەم، نان ئەکرم، دووکان ئەچم... ئا گوڵی من، هەر ئەوەیە، ویش‌ش خوا بتگرێ چی بوو؟ پشیلەیە هیچ نییە، کەم نەزگەرە بکە هەر ئێستا زبڵەکان دائەنێم و هەڵدێنین، ئاگات لێ بێ کە نزیکی ماڵ بووینەوە، هێواش ئەڕۆم با ئەگەر بە رێکەوت کەسێک لە پەنجەرەکەوە چاوی لێمان بوو بۆ حاجی و کاکە برای نەگێڕێتەوە. ئەزانم حاجی ئەڵێ:

- ئەو رەعنایە وا بە ئەندازەی گامێشێک ئەبێ لە پشیلەیەکی حیز ئەترسێ! تووڕە مەبە. حاجیە ئیتر چی لێ ئەکەی؟ ئەزانم کاکە براش پێ لەسەر پێ ئەخات و ئەڵێ: - نەمگوت! نەمگوت ئەگەر ژن چاکیان هەبایە...

پیاو لە تاریکی و تەنیاییدا زۆر ترسێنەرە... وەیی... کە تاریکە، کچم مەترسە با منیش نەترسم، ئەوە چییە خوایا... تۆش گەرمی هەناسەی... حەح کە بۆنی ناخۆشە، بۆ گەنیوی... مەترسە... مەزریکێنە... تکایە...

حاجی فووم لێ ئەکا، هەناسەی گەنیوە، بۆنی شەراب... چاوم لێیە زیرەک بە خەمگینییەوە دێتەوە، هەر کە چاوی ئەکەوێ بەو پیرەژنانە وا ئێستا ئیتر بیانووی چاکیان دەستکەوتووە کە تا سێشەممەش دایکوتێن و ئاگایان لێم بێ، ئەگەشێتەوە. تکایە... وەرە بە باڵامدا گۆرانی بڵێ. بە خاڵەکەی لا لێوم، قەیدی ناکا دەم و لوتم ماسیوە و حەز ناکەی وا بمبینی، تەنیا دوو گوڵم مابوو، ئیتر بەو قەناعەتە گەیشتبووم با هەموویان لە جۆرێکی مووروو دروست نەکەم، با

جیاواز بن، وەک چۆن ئەو هەموو زەوقی خواردنە لەم کاولەو بووەدا ئەناسمەوە لەم کاولەو بووە.

تکایە وەرە بە باڵامدا گۆرانی بڵێ، تەسەور بکە کاتی خۆی بە زرەی پامموورە و گوارەکانم دین و ئیمانم لێ تاراندووی.

بێگومان کانت پیاوە ئەگینا هەر کە ئەبوو بە سێ مانگت ناوەکەی بە سەرتدا ئەسەپاند و کەس بۆی نەبوو بیگۆڕێ.

ئەبی بە گۆچانی دەستم؟ ئەزانی ئێستا چوار کراس و حەوت دەسماڵ و پشتێنت هەیە؟ بڵێی وەستا ئەحەدی هێنابێتە سەر ماشینی جل شۆرییەکە؟

ئەم گوڵگەلە لەسەر کراسی کافیە خانمەوە چەند ئاشنایە، لە کوێ بینیومە؟ ئەوەی منە؟ نە نە... مەحاڵە شتی وا... هەموو ئەو گوڵانەم لە زەینی خۆمدا دارشتوون، پێم گوتی کەس نییەتی تەنانەت ژنەکانی پێنجشەممە ئەی بۆ کافیە خانم هەیەتی؟

چەتیوەی سەگە خەوتووی ئەزانم، خۆت لە مردوویی داوە، بەو خودایە کە گەورە بی هەمووان ئەفرۆشی و دەربایسی هیچ نایەی! پیاو بوو یا پشیلە یا جنۆکە؟

نا ناگریم... چۆن ئەگریم؟ حەیامان ئەچێ، ئەزانم کاکە برا چاوەڕێیە فرمێسکەکانم ببینێ و بڵێ: - نەمگوت... نەمگوت؟

سنە

٢٠١١/١١/٧



## وەرگێڕان

بارە فەرهەنگییەی کە لەسەر شانی نابوو، یەکانگیر بێت. بەرهەمی چەندین نووسەری وەک ڤیکتۆر هۆگۆ، چارلز دیکنز، هاوار فاست، دستۆیۆفسکی، ئەی. ئێم. فۆرستەر، برتراند راسڵ، جۆرج ئیلۆت، تۆماس هاردی، ماکسیم گۆرگی و چیخۆفی وەرگێڕا. لە بواری مێژوویی و رەخنەی ئەدەبیشدا چەند کتێبی مەرجەعی وەک گەشت بەناو ئەدەبی خۆرئاوادا، گەشت بە ئەدەبی روسیادا، ئەدەبی ئەفریقا و مێژووی ئەدەبی یۆنان و لە هەمووی گرنگتر چوار بەرگی مێژووی کۆمەڵایەتی هونەری وەرگێڕاوە، کە بەرهەمی کارێکی پڕ لەزەحمەت و سەبر و تاقەتێکی لەڕادەبەردەر بوو. وەرگێڕان لای ئەو پڕبوو لە قەلەقی نەک کارێکی تەکنیکی، وەسواسی ئەم وەرگێڕە بەڕادەیەک بوو کە دوای وەرگێڕانی کتێبێکی ٧٠٠ لاپەڕەیی بەناوی (شێرلی) لە نووسینی شارلۆت برۆنتە، لەبەرئەوەی بە کتێبێکی دژە کرێکاری زانی، چاپی نەکرد، خۆی دەڵێت: "لەبەرئەوەی بیر لە چاپکردنی نەکەمەوە، دڕاندم".

### منداڵی لە بانە

ئیبراهیم یونسی لە ساڵی ١٩٢٧ لە شاری بانە کە لەوکاتەدا پێی دەوترا (قەسەبە)، لە کوردستانی رۆژهەڵات لەدایک بوو. دەربارەی ساڵی لەدایکبوونی دەڵێت: "ئەم مێژووە رەنگە راست نەبێت، شوناسنامە زۆر درەنگ گەیشتە کوردستان وەک هەموو شتەکانی تر. ساڵی ١٩٣٢ یان ١٣١١ بوو کە شوناسنامەیان بۆ دەرکردم. لەبیرمە لەبەر جیاوازیی تەمەنم زۆرجار دایکم و باوکم کێشەیان بۆ دروست دەبوو. دایکم دەیوت تەمەنی ئیبراهیم زۆر نووسراوە و باوکم دەیوت راست نووسراوە. دایەگەورەم لە سیستمی بەزۆرناردن بۆ سەربازیی دەترسا و دەیوست تا ئەو شوێنەی دەتوانێت رۆیشتنم بۆ سەربازیی دوابخات. هەربۆیە هەوڵی دەدا بە بچووکترم بداتە قەڵەم". بەپێچەوانەی خەڵکی تر کە ئەمە دەکەنە بیانوویەک بۆ تەمەنێکی کەمتر لە پێناسەکەیان، دەڵێت: "بەپێی ئەو رووداوانەی کە لەیادم ماوە، پێموایە دووسێ ساڵ گەورەتر بم لەو بەروارەی کە لە شوناسنامەکەم نووسراوە".

یونسی دوو ساڵان بوو کە دایکی لەدەست دەدات و لە ماڵی دایەگەورە و باوە گەورەی دەمێنێتەوە. خۆی دەڵێت: "ئەم دووانە زۆر قانیع و زەحمەتکێش و زۆر دەستکورت بوون". باپیری بەهۆی ئەو پیشە جۆرواجۆرانەی کە دەیزانی (خەیاتی، دارتاشی، کرێکاری) بژێویی ژیانی پەیدا دەکرد. پیاوێک بوو زۆر خۆش مەجلیس و قسەخۆش و رووگەش. دایکی لە کچانی رەعیەت و باوکی

یەکێک لە خانزادە و ئاغاکانی ناوچەکە بوو، واتە سلێمانخانی نەوەی یونس خان، حاکمی بانە. ماڵی باوکی ماڵێکی زۆر قەرەباڵغ بوو. پێنج خوشک و سێ ژنی باوکی، سێ برا، برازایەک و ژمارەیەکی زۆر خزمەتکار... هەریەکێکیان بۆ خۆی حکومەتێک بوو و ویناییەکی تایبەتیان لەسەر خۆیان و ماڵە گەورەکەیان هەبوو. خێزانی باوکم هەموویان زۆر ساویلکە و سادە بوون، جگە لە من و دوو مامم. ئێمە لەلایەکەوە سادە و لەلایەکی ترەوە زۆرزان بووین. من لە پانزە ساڵیدا بەڕێکەوت نەبێت نەڕۆیشتبووم بۆ ماڵی باوکم و هەموو جارێک کە ڕێم دەکەوتە ئەوێ سوکایەتیم پێدەکرا. دایەگەورەم نەیدەهێشت بڕۆم".

## مێردمنداڵی و خوێندن

ئیبراهیم لە دوانزە ساڵیدا خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی دەوڵەتی پەهلەوی تەواو دەکات، بەڵام حەز لە درێژەدان بە خوێندن دەکات، لەوکاتەدا لە بانە ئامادەیی نەبوو. باوکی بۆ خوێندنی ناوەندیی ناردی بۆ سەقز کە شەست کیلۆمەتر لە بانە دوورە. لە سەقز عەبدولقادر بەهرامی و ئەحمەد تەوەکولی دەناسێت و تا کۆتایی ئەم هاوڕێیەتییە دەپارێزێت. لە ساڵی ١٩٤٢ سێ ساڵی یەکەمی ئامادەیی لە سەقز تەواو دەکات. لەم کاتەدا ئێران لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە داگیر دەکرێت. یونسی دەڵێت: "بە داگیرکردنی وڵات، ناوچەکە شێوا و بەرەو خێڵەکیبوون ڕۆیشت. ئیدی قوتابخانە نەما و من تا ساڵی ١٩٤٤ بێکار بووم". هەر لەم ساڵەدا سوپا بە دەرکردنی بەیاننامەیەک خێزانە خێڵەکییەکان هاندەدات کوڕەکانیان، ئەگەر مەرجی پێویستیان هەبێت لە قوتابخانەی سەربازیی، یان ئەکادیمیای ئەفسەری ناونووس بکەن. ئیبراهیم یونسی هەموو مەرجەکانی هەیە، ڕوو لە تاران دەکات و لە ساڵی ١٩٤٤ لە ئامادەیی ڕژێمدا ناوی تۆمار دەکات.

لە ئامادەییەکەدا لەگەڵ هاوڕێی هەمیشەیی ژیانی دکتۆر ڕوحوڵا عەباسی ئاشنا دەبێت. دەربارەی ئەم هاوڕێیەی نووسیویەتی: "زۆرباش لەبیرمە ئەوکاتە ئێمە یەکترمان بینی، تەنها تازەپێگەیشتوویەک بووین. هەردووکمان لە دەرەوەی تارانەوە هاتبووین. ئەو لە ئابادەوە و من لە بانە. هەردووکمان لە ئامادەیی سەربازیی بووین. ئەوسەردەمە تا ئەو شوێنەی ئێمە دەمانزانی تەنها دوو دامەزراوەی فێرکردنی شەوانەڕۆژی لە وڵاتدا هەبوو: یەکێکیان قوتابخانەی سەربازیی و ئەویتریان ئەکادیمیای موقەدەماتی، ئێمە هاتبووین بۆ ئامادەیی سەربازیی. ساڵی ١٩٤٤ بوو، هەردووکمان دوو ساڵ لە خوێندن دابڕابووین.

ئەوکات حەوشەی گەورەی ئامادەییەکە تەنها گڵۆپێکی رووناک بوو. لەبیرمە هەر لە شەوی یەکەمەوە کە هاتمە ژوورەوە وەک غەریبێک بە حەوشەکەدا دەگەڕاین و بیرمان لە غوربەت و دووریی و داهاتووی خوێندن و ئەم بابەتانە دەکردەوە... کە یەکێک لەناو تاریکییەوە بەرەو لام هات، سڵاوی لێکردم، پرسیاری کرد ناوم چییە و خەڵکی کوێم. پێم وت و ئەویش خۆی پێناساندم و وتی کێیە و لەکوێوە هاتووە... لە درێژەی قسەکانیدا بە بێ هیچ پێشەکییەک وتی ئیبراهیم وەرە پێکەوە هاوڕێ بین"... بووین بە هاوڕێ و تا ئێستاش ئەم هاوڕێیەتییە بەردەوامە بە هەموو هەڵکشان و داکشان و لار و لەوێریی و قسەلەیەکتر دابڕین و ئاشتبوونەوەکانەوە.

بەکالۆریۆس وەردەگرێت و دواتریش هەر بەیارمەتی ئەو کە لە فەڕەنسا مامۆستای زانکۆیە، بۆ درێــژەدان بە خوێندن بەرەو پاریس دەڕوات و تا وەرگرتنی دکتۆرا بەردەوام دەبێت.

### گەنجێتی، ئەفسەرێکی تودەیی

ئیبراهیم یونسی لە ساڵی ١٩٤٦ دیپلۆم وەردەگرێت و دەڕواتە ئەکادیمیای ئەفسەریی. لە ساڵی ١٩٤٩ بە پلەی (مولازمی دووەم) هێزی سواری ٢ لە ئەکادیمیا دەردەچێت و بەرەو ورمێ و رەزاییە بۆ خزمەت دەڕوات. لەوێ لە ساڵی ١٩٥٠ هاوسەرگیریی دەکات. بەرهەمی ئەم هاوسەرگیرییە سێ کچ و کوڕێکە. لە رەزاییە سەردەمێکی قورس بەڕێ دەکات. کچە چل رۆژەکەی تووشی نەخۆشی دەبێت. هەر لەوێ لە ١٩٥١ گوللەی بەردەکەوێت و قاچێکی لەدەست دەدات. "بەفرێکی قورس دەباری، قاچێکیان بڕیمەوە". سوپا بۆ دروستکردنی قاچی دەستکرد بەرەو ئەڵمانیا و فەڕەنسا دەینێرێت.

لە گەڕانەوەیدا بۆ تاران لە جبەخانەی سوپا لە شەقامی (سپە) دەستبەکار دەبێت. لە ساڵی ١٩٥٤ دەچێتە ناوحیزبی تودەی ئێرانەوە کە لەوکاتەدا بووەتە حیزبێکی گەورە و گشتی و زۆربەی ئەو گەنجانەی خەونیان بە گۆڕانەوە دەبینی، تیایدا ئەندام بوون. وەکو خۆی دەڵێت: "ئەو سەردەمە، کاتی گڕوتین و سەرمەستی بوو..." دەبێتە ئەندامی رێکخراوی سەبازیی حیزب. لە ساڵی ١٩٥٥ ساڵێک دوای ٨/٢٨ رێکخراوی سەربازیی پەیوەست بە حیزبی تودە کەشف دەبێت. "رێکخراوەکە کەشف بوو و ئێمەی ئەفسەری ئەندامیش هەموو حوکم دراین و کەوتینە زیندان". ئەفسەرانی ئەندامی رێکخراوی سەربازیی پۆل پۆل دەستگیر و دادگایی دەکرێن. یونسی لە گرووپی دووەمدایە و هەموویان

حوکمەکەیان لەسێدارەدانە. لەچاوەڕوانی جێبەجێکردنی حوکمەکەدایە کە لەدەستدانی قاچێکی لەکاتی خزمەتدا بەهانایەوە دێت. "تا ساڵی ١٩٥٥ لە بەشی پاشەکەوتەکانی سوپا بووم. لەم ساڵەدا بوو کە دوای کودەتای ١٩٥٤/٨/٢٨ ڕێکخراوی سەربازیی سەر بە حیزبی تودەی ئێران کەشف بوو و ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەران دەستگیرکران. منیش یەکێک بووم لە گرووپی دووەم و لە ١٩٥٥/١٠/٢٢ دادگایی کرام. لە دادگای سەرەتاییدا هەموومان بە لەسێدارەدان حوکم دراین. لەکاتی جێبەجێکردنی حوکمەکەدا پێیان وتم کە بەهۆی لەدەستدانی قاچت لەکاتی خزمەتی سەربازیی، پلەیەک سوکتر یاخود مافی لێبووردنت بۆ دەردەچێت".

## زیندان، شوێنێک بۆ خودسازی و خۆ ڕاهێنان

ئیبراهیم یونسی حوکمەکەی کەم دەکرێتەوە بۆ زیندانی تاهەتایی لەگەڵ کاری قورس. تا ئەم کاتەش نە لە دنیای نووسیندایە و نە تەنانەت زمانی بیانیش دەزانێت. لە زیندانی لەشکری زرێپۆشی عەباس ئابادەوە بەرەو زیندانی کۆشک دەگوازرێتەوە. لە ساڵی یەکەمی ناو زیندانda بە یارمەتی فەرهەنگێک، فەڕەنسییە لاوازەکەی بەهێزتر دەکات. کاتێ دەرگای زیندانی بەڕوودا دەکرێتەوە و سەیر دەکات هەموو هاوزیندانییەکانی خوێندوویانە. هەندێکیان لە دەرەوە خوێندوویانە و بەدەر لە پسپۆڕی خۆیان زمانزانیشن. زیندان لای دەبێتە زانکۆ. زۆرێک لە زیندانییەکانی ئەوساڵانە کاتێ لە زیندان ئازادکران، لانیکەم فێری یەک دوو زمان بووبوون. زۆربەیان لە زیندان دەستیان دایە وەرگێڕان و نووسینی کتێبی زۆر بەبایەخ. ئیبراهیم یونسی بەیارمەتی هاوڕێکانی لە زیندان فێری زمانی فەڕەنسی و هەر لەڕێگەی ئەوانەوە ئاشنای ئەدەب و نووسین دەبێت. تامەزرۆی فێربوون و نووسین دەبێت. بەیارمەتی هاوڕێکانی لەناوەوە و دەرەوەی زانکۆ، بۆ فێربوونی بنەڕەتەکانی نووسین، بەردەوام نامە بۆ ڕوسیا و ئەوروپا دەنێرێت و لەڕێگەی (فێربوونی نووسینەوە) ڕوو لە قوتابخانەی نووسینی بەریتانیا دەکات. لە زیندان کتێبی وانەیی دەخوێنێت، ڕاهێنانەکان ئەنجام دەدات و یاداشتیان لێ هەڵدەگرێت.

یادداشتەکان فراوانتر دەکات و بەشێوەی کتێبی هونەری چیرۆکنووسین بڵاوی دەکاتەوە. هەمووجارێک کە سیاوەش کەسرایی سەردانی دەکات بەشێکی پێ دەدات، سیاوەش دەیدات بە بڵاوکەرەوەیەک و چاپی دەکات. لە زیندان بەردەوام دەبێت لە کارکردن...

## له دایکبوونی وەرگێڕ لە زینداندا

لێرەوە ئیدی ڕێگەی خۆی دۆزیوەتەوە. ڕێگایەک کە تا کۆتایی تەمەن درێژەی پێ دەدات. زیندان دەبێتە ڕێگایەک بەرەو ئازادی. (ئارەزووە گەورەکان)ی چارلز دیکنز لە زیندان وەردەگێڕێت. دەربارەی ئەم وەرگێڕانە وتوویەتی هەر ئەو سەردەمەی لە زیندان بوو، پرسیار لە سیاوەش کەسرایی دەکات کە برایەکی لە زیندان بوو و بەردەوام سەردانی دەکرد، کەسرایی هانی دەدات بۆ وەرگێڕانی ڕۆمانەکە، یونسی بە قسەی دەکات. کتێبەکە لەژێر چاودێریی سیروس پەرهام بڵاودەبێتەوە لە ساڵی ١٩٥٨ لەکاتێکدا وەگێڕەکەی لە زیندان بوو، زانکۆی تاران وەک باشترین وەرگێڕانی ئەو ساڵە هەڵیدەبژێرێت. کتێبی (جادووکراو)ی سۆلۆمۆن ڕۆبینڤیچ (١٨٥٩-١٩١٦) نووسەری رووسی جوو، (ماڵی یاسا)ی چارلز دیکنز و (سپارتاکۆس)ی هۆوارد فاست لە وەرگێڕانە گرنگەکانی ئەون لە سەردەمی زینداندا.

## نووسەری پرۆفیشناڵ

ئیبراهیم یونسی دوای هەشت ساڵ لە ١٩٦٣ ئازاد دەکرێت و ئێستا کاتی هەژاریی و بێکارییەتی. قەدەغەکراوە کار بکات. وەکو خۆی دەڵێت: "سەردەمی بێکاریی و دەستکورتی بوو".

لەدوای زیندان سێ ساڵ بێ کار دەبێت. دواتر لەگەڵ (محەمەد قازی) و (بە ئازین)، کە ئەویش هەمان کێشە و ئازاری هەبوو، لە بەشی وەرگێڕانی کۆمپانیای دانیمارکی کامپساکس کە ڕێگەی ئاسنی ئێرانی دروست دەکرد، دامەزران. (ئەو تودەییانەی کە لە زیندان ئازادکران، ئەگەر توبەیان نەکردایە و لە دامەزراوە حکومییەکاندا دانەمەزرانایە، ناچار بوون ڕوو لە کەرتی تایبەت بکەن).

هاوڕێیەتی لەگەڵ قازی لێرەوە پتەو دەبێت و قوڵ دەبێتەوە. قازیش هاونەتەوەی خۆیەتی و لە ساڵانی ئامادەییشەوە دەیناسێت. قازی یاسای خوێندبوو، کارمەندی وەزارەتی دارایی بوو و وەک خۆی وەرگێڕ بوو. ماوەی ساڵێک لە کۆمپانیای کامپساکس هاوکاری قازی دەبێت و پێنج شەش ساڵێک دەبنە هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتر. یان لەگەڵ خێزانەکانیان لە ماڵەوەن، یان لە دەرەوە لە کافە و کۆڵانەکاندا پێکەوەن. ئەندازیار عیزەتوڵا ڕاستکار، برای فەهمیمە ڕاستکار، هاوسەری نەجەف دەریابەندەری (وەرگێڕی ناودار)، کە کاریگەرییەکی زۆری لە ڕێکخراوی پیلاندانان هەبوو، لە بنکەی ئاماری ئێران، بەشێک لە ڕێکخراوی پیلاندانان، کارێکی بۆ دەدۆزێتەوە.

سەرەتا وەک لێکۆڵەر، دواتر وەک وەرگێڕ و پاشان وەک سەرۆکی ناوەندی وەرگێڕان کار دەکات، پیشەیەک کە لە هیچ دەزگایەک نەیخوێندووە و هیچ بڕوانامەیەکی ئەو بوارەی نییە. هەرچەند لە زۆربەی ئەوانەی دەرچووی ئەکادیمیاکانن باشتر دەیزانێت: "هەموو سەرۆکێکی نوێ کە دەهات کاتێک پرسیاری ئەوبەشەی دەکرد کە خوێندوومە، سەری دەسوڕما و ڕەنگە هەندێکیش بێتاقەت دەبوو، چونکە سەرۆکی ناوەندی وەرگێڕان بووم، ئەوکاتە ناچاربووم هەندێک یاری بکەم تا وەک سەرۆکی نوێ بەڕەسمی بمناسن و وانەزانن لە شوێنێکەوە بەزۆر دانراوم".

ئیبراهیم یونسی لە ساڵی ١٩٧٢ بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕووی لە پاریس کرد و لە ساڵی ١٩٧٨ دوای وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرای ئابووری گەشەپێدان لە زانکۆی سۆربۆنی فەرەنسا، گەڕایەوە بۆ تاران".

## یەکەمین پارێزگاری کوردستان دوای شۆڕش و دەستلەکارکێشانەوەی

دوای شۆڕشی ئیسلامی، بۆ ماوەیەکی کورت پێش ڕۆیشتنی سادق خەلخالی بۆ کوردستان، پارێزگاری کوردستان بوو، بەڵام بەو شێوەیەی کە بە ڕۆژنامەی "کەیهان"ی ئەوکات وتبووی: "(بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ سیاسەتەکانی دەوڵەت لە بەرامبەر کوردستان، دەستی لە کارکێشایەوە. ڕۆژنامەی کەیهان نووسی: "دکتۆر ئیبراهیم یونسی پارێزگاری دەستلەکارکێشاوەی کوردستان، ئەمڕۆ دەستێوەردانی بەرپرسەکانی دەرەوەی کوردستانی ئیدانەکرد و بەرپرسیارێتی ڕووداوەکەی مەریوانی خستە ئەستۆی ئەو کەسانەی بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی ناوچەکە، سەرباز ڕەوانەی ئەوێ دەکەن".

کەیهان دەنووسێت: "دکتۆر یونسی کە ٢١ ڕۆژ پێشتر دەستلەکارکێشانەوەی خستووەتە بەردەم وەزیری وڵات، ڕایگەیاند کێشەکانی خەڵکی کوردستان گەلێک زۆرن، زۆربەی کێشەکانی ئەم ناوچەیە بەرهەمی ڕەفتاری کەسانی سەر بە ڕابردووە و ئێستاش هەندێک لە کۆمیتەکان و بەرپرسە نا مەسئولەکان درێژە بەم دۆخە دەدەن. من لە سەرەتای کارکردنمەوە هەوڵم دا لەنێوان گرووپە جیاوازەکاندا لێکتێگەیشتن و ڕێکەوتن دروست بێت بۆئەوەی بەپێی ئەم ڕێککەوتنە، ئارامی بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکە. هەربۆیە دەبوو سەرەتا کۆمیتە و سەربازەکانم تەسفییە بکردایە. دوای ئەوەش دەبوو سەرقاڵی بابەتی کۆمیتەکان بوومایە. یەکێک لەم کۆمیتانە کە ئەحمەد موفتی زادە بەڕێوەی دەبرد، بووە هۆی دروستکردنی کێشە و گرفتی زۆر لە ناوچەکەدا. ئەم کۆمیتەیە دوای

گفتوگۆ لەگەڵ ئایەتوڵا تاڵەقانی هەڵوەشایەوە، بەڵام بەڕێز موفتی زادە بەم هەڵوەشاندنەوەیە رازی نەبووە".

ئیبراهیم یونسی دواتر ئاماژەی بە دەستلەکارکێشانەوەی خۆی دەکات و دەڵێت: "لەگەڵ ئەوەی توانیم بۆ ماوەی ٣ مانگ ئارامی لە ناوچەکەدا بەرقەرار بکەم، بەڵام هەندێک کێشەی کە لەسەرەوە باسکرا و بێ ئەنجامبوونی هەوڵەکان، منی بەرەو تەرکیزخستنە سەر ئەو بابەتە برد کە یەکەم دەزگای بڕیاردان یەک نییە و دووەم لە بڕیارەکانیشدا نییەتی باش بەدی ناکرێت. بۆ نموونە ئێمە کۆمیتەی پیاوێکی ئاینی هەڵدەوشێنین، دواتر کوڕەکەی لە کۆمیتەی مەرکەزی تارانەوە فەرمان وەردەگرێت و لەگەڵ خۆی پاسدار رەوانەی ناوچەکە دەکات. هەر ئەم پاسدارانە ئەمڕۆ لە بیجار لەگەڵ خەڵک کێشەیان بۆ دروستبووە و ٤ کەس کوژراون... ئەم جۆرە بێ سەروبەری و فرە بڕیاردانە کاری پارێزگای ئیفلیج کردووە تا ئەوەی کابینەکە سەرلەنوێ دروستکرایەوە و منیش هەستم کرد کە هەڵسەنگاندنی بەرپرسە تازەکان هەڵسەنگاندنێکی زیهنییە و پشتی بەکردار نەبەستووە. هەربۆیە هاتمە تاران و پێشنیارەکانی خۆم بۆ چاکسازیی بارودۆخی کوردستان پێشکەش بە دەوڵەت کرد، بەڵام هەستم کرد کە دەوڵەت ئەگەریش دەستێوەردان نەکات، لە هەلومەرجێکدا نییە کە شتەکان خراپتر نەکات، یاخود رێگە بە من بدات خۆم ئەوکارە بکەم. لەڕاستیدا دەوڵەت بەهۆی کاریگەریی ناوەندەکانی دیکەوە دەیویست کەسانێک کە رەگوڕیشەیان لە کوردستان نییە، بەسەر کوردستاندا بسەپێنێت. بەداخەوە ئەم بارودۆخە لە بەریەککەوتنی مەریواندا بوو بە واقیع و ئاکامی دڵتەزێنی لێکەوتەوە".

دکتۆر یونسی دەڵێت: "کەسانێک کە لە ناوچەکەدا دەستێوەردان دەکەن یان بڕیار لەسەر کوردستان دەدەن، بەهیچ شێوەیەک ناوچەکە ناناسن، ئەوان نازانن کە ئەم ناوچەیە پڕ چەکە، هەربۆیە بەپێی بنەمای زیهنی نەک کردار، هەنگاو دەنێن". پارێزگاری دەستلەکارکێشاوەی کوردستان لەم گفتوگۆیەدا رایدەگەیەنێت کە: "نەیاری شۆڕش رۆڵێکی ئەوتۆیان لە کوردستاندا نییە و زۆربەی کێشەکان رەگوڕیشەیان لە دەسەڵاتخوازی فەردیدا هەیە". ئەو وتی: "ئەم لاوازییە فەردیانە زیانی گەورەو قەرەبوونەکراوی لێدەکەوێتە... سەدر حاج سەید جەودای ئەم تایبەتمەندییانەی دەناسی و بە بارودۆخی کوردستان ئاشنابوو، بەڵام وەزیری هەنووکەیی وڵات (هاشم سەباغیان) ناوچەی کوردستان ناناسێت و بارودۆخەکە بە دەستکاریکراویی دەگاتەوە لای ئەو و بەپێی ئەو زانیارییانەش بڕیار دەدات. منیش ئامادە نیم گێرەشێوێنی ئەو کەسانەی کە لەدەرەوە دەستێوەردان لە

ناوچەکەدا دەکەن، تەحەمول بکەم. من بۆ ماوەی ٨ کاتژمێر بۆ ئاگادارکردنی ئەم وەزیرە بەڕێزە لەبەردەم ژوورەکەی چاوەڕێم کرد، لەکاتێکدا کە ئەو کاری رۆژانەی وەک واژۆی کاغەزەکانی ئەنجام دەدا... لەم بارودۆخەدا بەڕاستی کار ناکرێت".

یونسی ئاماژەی بە رووداوەکەی مەریوان کرد و وتی: "ئەندامانی کۆمیتە هەڵوەشاوەکەی موفتی زادە دوێنی سەرۆکی شارەوانی مەریوانیان رفاندووە و فەلاقەیان کردووە، ئەمڕۆ بە تەلەفۆن لە هۆکارەکەیم پرسی، سەرۆک شارەوانی وتی: هەندێک لە سەربازەکان بەهۆی بەدرۆخستنەوەی دەستێوەردانی حیزبی دیموکرات لە رووداوەکـەی مەریوان بە مەبەستی کوشتن فەلاقەیان کرد". پارێزگاری کوردستان لەم گفتوگۆیەدا رایگەیان کە خەڵکی کوردستان بەهیچ شێوەیەک جودایی خواز نییە و تەنها ئۆتۆنۆمیان دەوێت، ئەوان دەیانەوێت خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرن. یونسی لە کۆتایی گفتوگۆکەدا دەڵێت کە بەبڕوای من لایەنگریکردن لەوکەسانەی کە لە ناوچەکەدا نامۆن و دەخالەتی ناڕەوا دەکەن، رەتکردنەوەی ئامانجە ئیسلامییەکانە. (کەیهان ١٣٥٨/٤/٢٦)

دەستلەکارکێشانەوەی یونسی ناڕەزایی زۆربـەی خەڵکی کوردستانی لێکەوتەوە. کۆمەڵەی کوردانی دانیشتووی ناوەند داوایان لە دکتۆر یونسی کرد، دەست لەکار نەکێشێتەوە. وتەبێژەکەیان وتی: "بەپێی ئەو بروسکانەی کە بۆ پشتگیریکردن لە دکتۆر یونسی لە شارە جیاوازەکانەوە گەیشتووەتە کۆمەڵەکەمان، ئەو تەنها کەسی قبوولکراوە لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە... ناردنی هەر پارێزگارێک جگە لە دکتۆر یونسی ناڕەزایەتی توندی خەڵکی کوردستانی لێدەکەوێتەوە". (ایندگان ١٣٥٨/٤/٢١ دکتۆر یونسی ١٩٨٠/١٠/٥ دەستی لە پۆستی پارێزگاری کوردستان کێشایەوە و گەڕایەوە بۆ تاران. ناوبراو هۆکاری دەستلەکارکێشانەوەی بۆ "ئەو بڕیارانە گەڕاندەوە کە لەتاران بە راوێژکردن لەگەڵ پارێزگار و بەبێ ناسینی بابەتییانەی ناوچەی کوردستان، دەربارەی ئەم پارێزگایە جێبەجێ دەکرێت".

یونسی لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ رۆژنامەی (ایندگان)، جەختی لە پێویستی ئارامیی کوردستان کردەوە و وتی: "کاتێک ئارامیی لە کوردستان بەرقەرار نەبێت، کێشەی ئابووریی و ئاوەدانکردنەوە چارەسەر ناکرێت". هەروەها دەڵێت: "ئەو هەنگاوانەی کە لە ناوەندەکانی بڕیاردانی تارانەوە دەگیرێتە بەر، دەبێ بەقوڵی روح و هەلومەرجی ناوچەکە بناسن، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی بڕیار دەدەن ئەو ناسینەیان نییە، نەک ناتوانن ناوچەکە ئارام بکەنەوە، بەڵکو

دەبنە هۆکاری دروستکردنی چەندین کێشەی تر".

"ایندگان" دەنووسێت یونسی دەربارەی قبوولکردنی دەستلەکارکێشانەوەکەی لەلایەن دەوڵەتەوە دەڵێت: "کاتێ ویستم دەست لەکار بکێشمەوە، تازە بەڕێز سەباغیان بووبوو بە وەزیری وڵات و داوایان لە من کرد ماوەیەک پەلە نەکەم. من و دەوڵەت چەند قسەیەکمان ئاڵوگۆڕ کرد، بەڵام بێ ئەنجام بوو. منیش درێژەدان بە کارەکەم بە دژوار بینی و هاتمەوە بۆ تاران. هەڵبەت تا ئێستا دەوڵەت دەربارەی دەستلەکارکێشانەوەکەی من بڕیاری دەر نەکردوو و تا هەنووکەش هیچ قسەیەک لەم بارەیەوە نەکراوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە نێوانی من و دەوڵەت، زمانێکی هاوبەش بوونی نییە و نەمانتوانیوە پێکەوە دیالۆگ بکەین". (ایندگان ١٣٥٨/٤/٢٨ ناوبراو لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەی کوردی هیوا، هەژاریی و بێکاریی گەنجان و توندوتیژی سەربازیی بە گەورەترین کێشەکانی کوردستان دەزانێت: "کێشەی ئێمە چەکە، کە هەموو کەسێک هەیەتی. هەروەها بێکاریی و بێ پارەیی، ئەو بێکارانەی کە دیپلۆمیان هەیە و نەڕۆیشتوون بۆ خزمەتی سەربازیی یان لێبووردنی یاساییان وەرگرتووە، یان لە گوندەوە بۆ شار کۆچیان کردووە، یان کەسانێک کە لەشارەکانی تر کاریان هەبوو، بەڵام گەڕاونەتەوە بۆ ئێرە و کاریان نییە".

دوای مانگێک سادق خەلخالی بە بڕیاری ئایەتوڵا خومەینی رووی لە کوردستان کرد و بە لەسێدارەدانی توندوتیژی بەکۆمەڵ لە شارەکانی کوردستان هەرلەوکاتەوە بناغەی حکومەتی ترس و نەفرەتی لە کۆماری ئیسلامی لەناو دڵی کوردستاندا چاند.

ئیبراهیم یونسی ئەو کاتەی پارێزگار بوو، بەرهەمێکی تۆماس هاردی بەناوی سیروان ئازادەوە وەرگێڕا، بەڵام خۆی پارێزگار بوو، تاڕادەیەک نەیدەتوانی ناوی خۆی وەک وەرگێڕ لەسەر کتێبەکە دابنێت و بەناوی کچ و کوڕەکەیەوە بڵاوی کردەوە.

**سەرچاوە:**

http://www.voanews.com/persian/news/Ibrahim-Younesi-Passed-away-Translation-139239243.html

# حەقایەت، ئوستوورە و فەلسەفە
# (لە فەلسەفەی ئەفلاتووندا)



**جولیا ئەنەس**
**و. لە ئینگلیزییەوە: فاتح سەعیدی**

ئامانجی فەیلەسوف، راستییە و بەم گوێرەیە نابێت لە شێوازی حەقایەتگێڕانەوە کەڵک وەربگرێت، چونکە ئێمە لە کاتی گێڕانەوەی حەقایەتدا خۆمان بەو چیرۆکانەوە سەرقاڵ دەکەین کە دەزانین راستەقینە نین. ئەفلاتوون سەرەڕای ئەمە، بەئاشکرا لەگەڵ ئەو حەقایەتانە دژایەتی دەکات کە لە کولتووری ئەو سەردەمەدا جەماوەرپەسەند بوون و بەشێوەی شانۆگەریی و هەڵبەست بۆ گشت خەڵک پێشکەش دەکران. ئەفلاتوون، هێز و توانای ئەم شێوە گێڕانەوەیە بۆ درووستکردنی تێگەیشتن لە خۆمان و شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتیمان، دەناسێت. کاتێک ئەم هێزە، بێ بیرکردنەوە و بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکە نەریتییەکان کەڵکی لێوەردەگیرێت و دەتوانێت زیانی لێبکەوێتەوە، ئەفلاتوون بەتوندیی دژایەتی لەگەڵدا دەکات. بەتایبەت لە دایەلۆگی کۆماردا، ئەم خاڵە پیشان دەدات کە لەو سەردەمەدا پەروەردەکردن بە شێوازی کولتووریی و نەریتی، خەڵک لەگەڵ باوەڕە هەڵەکان دەربارەی خوداکان و خولیای هەڵە بۆ ژیان بەجێدەهێڵێت. ئەو چیرۆکانەی کە هۆمێر (Homer) و شانۆنووسە کۆنەکان بەرهەمیان هێناوە (کە هەمان دەوری بەزم و رابواردنی گشتی لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەبینن)، بەهاکانی کۆمەڵگای شەڕخواز، جوان و کەشخە پیشان دەدەن و خەڵک بۆ ژیان لە کۆمەڵگای شارستانی، کە تیایدا دەبێ بە هاوکاری لەگەڵ ئەوانی دیکە کار بکەن،

ئامادە ناكەن.

ئەفلاتوون بەتوندیی لەگەڵ شێوەی ئاراستەكردنی ئەو شتەی كە ئێمە داهێنەرانە و خەیاڵاوییان پێ دەڵێین و بێ بیركردنەوە، بۆ گەیشتن بە ئامانجی هیچ و پووچ و خەساراویی بەكاردەهێنرێن، دژایەتی دەكات، بەڵام ئەو، هەر وەك باسمان لێكرد، بۆ خۆی نووسەرێكی داهێنەر و خاوەن خەیاڵە (مەبەستی نووسەر لە بەشەكانی پێشوودایە) و بەزەحمەت دەكرێت بڕیار بدەین كە ئاگاداری تواناكانی خۆی نەبووە. سەرسپێردراوی ئەفلاتوون بڕیاری داوە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، لێكۆڵینەوەی فەلسەفی ئەنجام بدات و هەر ئەم ڕەوتە بە دوو شێوە هەڵوێستی ئەو سەبارەت بە بەهرەكانی، دەگۆڕێت.

یەكەم، ئەفلاتوون وا بیردەكاتەوە كە ڕۆڵی ئەم بەهرانە سنووردارە. هەندێك لە دایەلۆگەكان بەشێوەیەك نووسراون كە بەرەو بابەتی نافەلسەفی دەڕۆن، بەڵام ئێمە هان نادرێین كە لەو ئاستەدا بمێنینەوە. تەنانەت لە دایەلۆگە هاسانتر و سەرنجڕاكێشەكاندا، هەمیشە پەیامێكی ڕوون هەیە كە فەلسەفە سەرقاڵی بەڵگەهێنانەوە، لێپرسینەوە و تاقیكردنەوەی داخوازییەكانە و لەم ڕێگەیەوە واز لەوە دەهێنێت كە خەیاڵ پشتیوانێك بێت بۆ فەلسەفە.

سەرەڕای ئەمە، ئەفلاتوون ئەم بیرۆكەیە پەسەند ناكات كە خەیاڵ و داهێنان، لەبەر هۆكاری خۆیان بەهایەكیان هەبێت. بەكارهێنانی خەیاڵ و داهێنان لەلایەن ئەفلاتوونەوە، تەنیا بۆ پێشخستنی ئەو بابەتانەیە كە وەك هەڵوێستی ڕاستەقینە هەژماریان دەكات. یەكێك لە ناسراوترین ڕوانگەكانی ئەو، ڕەتكردنەوەی بیرۆكەی بێ زیانبوونی خۆشی و ڕابواردنە. ئەم ڕوانگەیە دەبێتە هۆی ئەوەی كە پیوریتانەكان[1] لە هەموو سەردەمێكدا لایەنگریی لە بۆچوونەكانی ئەو بكەن. بەگوێرەی ڕوانگەی ئەفلاتوون، بەهای دڵڕفێنیی و سەرنجڕاكێشبوونی چیرۆكێكی باش لەوەدایە كە ئێمە بۆ بیركردنەوە و تێڕامانێكی قووڵتر لەبارەی بەها چاكەكانەوە هانبدات و ئەگەر بەپێچەوانەی ئەمە بێت زیانی لێدەكەوێتەوە، چونكە ئێمە هان دەدات هەتا سەبارەت بە بەهاكانی كولتوورەكەمان هەست بە ڕازیبوون بكەین، ئەو بەهایانە كە لێپرسینەوەیان ئاراستە نەكراوە و لێیان ورد نەبووینەتەوە.

كەواتە، ئەفلاتوون تەواو ئامادەیە، هەتا لە نووسراوەكانی خۆیدا، لە شێوە نەریتییەكان وەكو وێنەی وەسفی و گێڕانەوەیی، ئوستوورە و ئەو چیرۆكانەی كە مرۆڤێكی قارەمان ڕۆڵیان تیدا دەبینێت، كەڵك وەربگرێت. هەرچەند، لە فەلسەفەی ئەفلاتووندا، ناوەڕۆكی ئەم شێوازانە بەتەواویی گۆڕانكاریی بەسەردا

هاتووە. بەتایبەت لەبارەی ئوستوورەوە ئەم رەوتە زیاتر دێتە بەرچاو، چونکە ئەفلاتوون لایەنگری ئەم بۆچوونە نییە کە بە فرەچەشنی دووجەمسەری خودایانی بێلایەن یان جەنگاوەر کە لە ژیانی مرۆڤدا دەستێوەردان دەکەن، بڕوات هەبێت. ئەفلاتوون لەجیاتی ئوستوورە، شێوەیەک لە تاکەخوداپەرەستی دادەنێت کە تیایدا خودا تەنیا بەرپرسی ئەو شتەیە کە چاکە. ئەفلاتوون لە دایەلۆگەکانی گورگیاس، فیدۆ، کۆمار، فیدروس و دەوڵەتپیاو، ئوستوورەکان پەرە پێدەدات و وەک بابەتێک بۆ گێڕانەوەی خەیاڵاویی کەڵکیان لێوەردەگرێت و بەم شێوەیە، لەسەر ئەو خاڵانە کە لەناو بەڵگەی دایەلۆگەکەدا هاتوون، پێداگریی دەکات.

لێرەدا بابەتی تەوساوی (ironic)[٣] ئەوەیە کە بە وتەی تاقمێک لەو کەسانەی کە بەرهەمەکانی ئەفلاتوون تەواو کاری تێکردوون، لەوانەیە کاریگەرترین بابەتێک کە ئەفلاتوون نووسیویەتی، چیرۆکی ناتەواوی ئەتلەنتیس (Atlantis) لە پێشەکی تیمائۆس و بەشی پچڕپچڕی کریتیاس بێت. ئەفلاتوون ئەم حەقایەتە بە گێڕانەوەی چیرۆکێک دەربارەی ئەسینای کۆن، کە فۆرمی نموونەیی حکومەتی بەدیدەهێنا و مەترسی پەلاماردان لەلایەن ئەتلەنتیسەوە، کە شارستانییەتێکی دەوڵەمەند و پێشکەوتوو لە خۆرئاوای جیهانی یۆنانی ئەو کاتەدا بووە، دەست پێ دەکات. ئەتلەنتیسیش بۆ خۆی لە بنەماوە یۆتۆپیا بووە، بەڵام کەموکوڕیی هێناوە و ڕێگای بۆ داگیرکەری ئیمپریالیستی خۆش کردووە. تەنانەت دەستپێکی ئەم چیرۆکە بووەتە هۆی هاندانی شێوەیەک لە یوتۆپیانووسی، چیرۆکی ئەوینداری، چیرۆکی لێوانلێو لە شەڕوشۆ و فیلمگەلێک دەربارەی ئەو بێگانە دەرەکییانە کە مەترسیان بۆ شارستانییەتی 'ئێمە' هەیە (زۆربەیان لە چیرۆکەکەی ئەفلاتوون کاڵوکرچترن و بە خوێنەرانی خۆیان ئەو دەرفەتە نادەن هەتا خۆیان بەهاسانی هاوسۆزیی لەگەڵ 'کەسە باشەکاندا' بکەن و کۆتاییەکی خۆشبینانەی ڕێکوپێکیان نییە).

بەڵام سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە ئەفلاتوون چیرۆکبێژەکەی ناچار دەکات هەتا چیرۆکەکە بە پێشەکییەکی دوور و درێژ سەبارەت بە بیستنی حەقایەتەکە لە زمانی قەشە میسرییەکانەوە دەست پێ بکات کە بە قسەی ئەو پێشینەیەکی کۆنتریان لە یۆنانییەکان هەیە. شارستانییەتی یۆنانی گەلێک جار خاپوور بووە و دیسانەوە سەریهەڵداوەتەوە و بەم گوێرەیە، یۆنانییەکان ئاگایان لە مێژووی خۆیان نییە. ئەم بیرۆکەیە بۆ خەڵکێکی زۆر کە بڕیاریان هەبووە، وێنەیەکی هەتا ئێستا شاراوە لە 'مێژووی ئێمە' ئاشکراکەن، دڵڕفێنییەکی ئێجگار زۆری هەبووە. ئەتلەنتیسی 'ڕاستەقینە' لەم شوێنانەدا 'دۆزراوەتەوە': لە مەدیتەرانە، لە

دوورگەی سێرا و لە شاری ترۆی و لە خۆرئاوای مەدیتەرانە، لە بەریتانیای پێش مێژوو، ئایرلەند، دانیمارک، ئەفریقای باشوور، یوکاتان، باهاماس، ئەمریکای باکوور و وەکو قارەیەکی بزربوو کە لە ئۆقیانووسی ئەتلانتیکدا نووقم بووە.

پیشەسازیی بەردەوامی دۆزینەوەی ئەتلەنتیس، مەترسی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی ئەفلاتوون روون دەکاتەوە، چونکە ئاشکرایە، ئەو لە شتێک کەڵک وەردەگرێت کە بووەتە ئامێری پێوەری نووسینی حەقایەت و چیرۆک. حەقایەت بریتییە لە پێداگریکردن لەسەر ئەو رەوتەی کە رووداوەکـان بەشێوەیەکی مێژوویی ریز بکرێن (دۆزینەوەی ئەو سەرچاوانە کە هەتا ئێستا نەناسراون) و نیشاندەری ئەو رووداوانــە بن کە لە داهاتوودا دەقەومێن. بیرۆکەیەک هەیە کە پێی وایە ئێمە دەبێت کەڵک وەربگرین لە چیرۆک بۆ تاقیکردنەوەی بیرۆکەکانمان دەربارەی حکومەت و دەسەڵات. ئەگەر بەجێگای بیرکردنەوە لەم کێشانە بە شوێن بەستێنی زەریادا بگەڕێین (ئاماژە بۆ دۆزینەوەی شتە ونبووە خەیاڵاوییەکان)، خاڵی سەرەکی بابەتەکەمان لە کیس داوە. خراپ تێگەیشتنی بەردەوام لە ئەفلاتوون وەکو مێژوونووس، لێرەدا ئێمە والێدەکات هەتا لەو هۆکارانە تێبگەین کە بڕواپێنەبوونی ئەفلاتوون بە نفیساری خەیاڵاویی، جاروبار، رەوایە.

**پەراوێز و سەرچاوە:**

١- پیوریتانەکان (Puritans): دەستەیەک لە ئیماندارانی مەسیحی پرۆتستانن کە لە سەدەکانی شانزە و حەڤدەی زایینیدا لە بەریتانیا دەژیان. پیوریتانەکان لە کاروباری ئایینیدا توندوتیژن و دژ بە زریقە و بریقەی ژیانی ئاسایین.(و)

٢- مێتۆدی بەڵگەهێنانەوە و گفتگۆکردنی سوکرات لە زۆربەی دایەلۆگەکانی ئەفلاتوون بە شێوازی تەوس و تەشەرەوەیە. سوکرات بەتەوسەوە بەردەنگەکەی دەدوێنێت و لە سەرەتاوە خۆی وا پیشان دەدات کە لەبارەی بابەتی مشتومڕەکەوە هیچ نازانێت، بەڵام بەرە بەرە لەڕێگەی پرسیارە وردەکانی دەڕواتە هەناوی باسەکە و نەزانی بەردەنگەکەی ئاشکرا دەکات. (و)

- ئەم وەرگێڕانە پاژێکە لە بەشی سێیەمی کتێبی (فەلسەفەی) ئەفلاتوون:

Annas, Julia (2003), •Fiction, Myth, and Philosophical•, in Plato, New York: Oxford University Press Inc., pp. 3842-.



لە چیرۆکی بیست هەزار فەرسەخ لەژێر دەریای جولز ڤێرن (١٨٧٠)، مسافرانی ناو ژێردەریایی کەپتان نیمۆ، کەلاوەکانی ئەتلەنتیس لەژێر ئاودا دەدۆزنەوە و بە گڕکانێکی ژێرئاویی رووناکی دەکەنەوە. ئەتلەنتیس لەناو چیرۆک و فیلمی زانستی- خەیاڵی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەمدا (وەک ئەنیمەیشنی کۆمپانیای دیزنی) وەکو شارێکی ژێردەریا پیشاندراوە، کە جاروبار خەڵکی تێدا نیشتەجێیە و لەلایەن چاونەترسانی ئازاوە دەدۆزرێتەوە.

# هەموو ساڵێک درۆیەک



عەبدولفەتاح کیلیتۆ
و. لەعەرەبییەوە: سامان عەلی حامید

چی پاڵ بە کەسەکانی هەزارویەک شەوەوە دەنێت بەسەرهاتی خۆیان بگێڕنەوە؟ پرسەکە زوربەی کات پەیوەندیی بە لێکدانەوەی ئەو بەدبەختیی و زیانەوە هەیە کە دووچاری هاتوون، بۆ نموونە کەسێک چیرۆکی ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن چاوێک لە چاوانی لەدەست داوە، یەکێکی دیکە باس لەوە دەکات کە چۆن بەشی لای خوارەوەی لەشی تا پێیەکانی رەق هەڵهاتووە، کەسی سێیەم بەسەرهاتی ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن رووخساری وەکی زەعفەران زەرد هەڵگەڕاوە... من، لەو بارەیەوە، باس لە لایەنێک لە "چیرۆکی ئەیوبی بازرگان و غانمی کوڕی و فیتنەی کچی دەکەم"[1]، سەرەتای ئەم چیرۆکەش بە دیمەنی سێ لە بەندەکان دەست پێ دەکات کە شەوێک بەیەکدی دەگەن و هەریەکەیان "هۆکاری خەساندنی" خۆی دەگێڕێتەوە (لە میانی وتوێژەکەیانەوە ئەوە دەردەکەوێت کە ئەوان ئارەزووی خواردنی گۆشتی مرۆڤ دەکەن، ئەمەش هانمان دەدات کە دەربارەی پەیوەندیی ئەو چڵێسییە بە خەساندنەوە پرسیار بکەین). بەندەی یەکەم لەبەرئەوە خەسێنراوە چونکە پەردەی کچێنیی کچی سەردارەکەی خۆی لابردووە، بەندەی دووەم چونکە خانمی سەرداری مارەبڕیوە، هەرچی بەندەی سێیەمە، کە ناوی کافورە، لەبەرئەوە خەسێنراوە چونکە درۆی لەگەڵ سەردارانی

کردووە. ئەو بەسەرهاتەش کە کافور بەسەریدا هاتووە و کە دواتر خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، دەبێتە بابەتی ئەم کورتە باسە.

کافور هەر لە منداڵییەوە خویەکی ئێجگار خراپی گرتبوو، "براکانم، زۆر چاک ئەوە بزانن کە من لە سەرەتادا تەمەنم هەشت ساڵ بوو، بەڵام لە هەموو ساڵێکدا درۆیەکم لای بازرگانەکان دەکرد تا بەشەڕ دەهاتن، ئیدی بازرگانەکەم لێم جاڕس بوو و رادەستی دەڵالی کردم و فەرمانی پێدا کە بانگ بکات: کێ ئەم بەندەیە بە خەوشەکەیەوە دەکڕێ؟ پێیان گوت: خەوشی چییە؟ گوتی: هەموو ساڵێک درۆیەک دەکات. پیاوێکی بازرگان هاتە پێشەوە {...} ئیدی پاشماوەی ساڵەکەم لای ئەو بەسەربرد تا ساڵی نوێ بە خێر و خۆشیی تێپەڕی کە ساڵێکی پیرۆزی پڕ پیت بوو بە رووەک، ئەوەبوو بازرگانەکان داوەتیان ساز دەکرد و هەر رۆژە و یەکێکیان داوەتی ساز دەکرد تا ئەو رۆژەی کە نۆرەی سەردارم هات، لەنێو بێستانێک لە دەرەوەی شاردا داوەتەکەی سازکرد، ئیدی خۆی و بازرگانەکان رۆیشتن و هەرچی شتێک لە خواردن و جگە لە خواردن {...} کە پێویستیان بوو، بۆیان برا. لەم کاتەدا سەردارم کارێکی کەوتە ماڵەوە ئیدی گوتی: "ئادەی بەندە سواری هێسترەکە ببە و بڕۆ بۆ ماڵەوە لای خانمی سەردارت فلان شت {...} بهێنە. کاتێک کە لە ماڵ نزیک بوومەوە دەستم کردە هات و هاوار و گریام، خەڵکی گەڕەک گەورە و پچوک خڕبوونەوە و خانمی خێزانی سەردارم {...} گوێی لە دەنگی هاوارم بوو، پێم گوتن: سەردارم خۆی و هاوەڵانی لە بن دیوارێکی کۆندا دانیشتبوون دیوار رما بەسەریاندا {...}، کاتێک کە منداڵەکانی و خێزانەکەی گوێیان لەم قسانە بوو، ئێخەی خۆیان دادڕی و کێشایان بە دەموچاوی خۆیاندا ئیدی هاوسێکان گەیشتنە سەریان، هەرچی خێزانی سەردارمە کەلوپەلی نێو ماڵی دا بەسەریەکدا و رەفەکانی هەڵکەند و قاپ و قاچاغ و پەنجەرەکانی شکاند {...} پاشان خانمی سەردارم بە رووخساری پەتیی و تەنها بە لەچکەکەی سەرییەوە هاتە دەرەوە و کچ و کوڕەکانیشی لە تەکی هاتنە دەرەوە و گوتیان: کافور پێشمانکەوە و شوێنی سەردارتمان نیشان بدە کە لە بن دیوارەکەدا مردووە تاوەکو لەژێر دار و پەردو دەریبهێنین و لە تابوتی بنێین و بیبەین {...}، پیاو و ژن و مێردمنداڵ و کچ و پیر نەما هەموویان لە تەکمان هاتن {...} ئیدی کاتێک کە سەردارم بینیمی رەنگی پەڕی و گوتی: کافور ئەوە چییە چی قەوماوە؟! منیش پێم گوت: کاتێک کە تۆ ناردمت بۆ ماڵەوە تا ئەو شتەت بۆ بهێنم کە داوات

کردبوو، چووم بۆماڵەوە و چوومە ژوورەوە تەماشام کرد دیواری هۆڵەکە رماوە و تەواوی هۆڵەکە رووخاوە بەسەر خانمی سەردارم و منداڵەکانیدا".

سەیر لەوەدایە کافور، کاتێک کە راستیی پرسەکە دەرکەوت، نە ترسی لێنیشت کە دەشێ لەپای ئەوە سزا بدرێت، نە هیچ گوێشی بە هەڕەشەکانی سەرداری دا، بەڵکو بەجۆرێکی بێ ئابڕووانە و لەخۆباییانە و بە توانایەکی لەرادەبەدەری شەڕ فرۆشیی و شەڕانگێزییەوە وەڵامی سەرداری دایەوە و گوتی: "سوێند بە خوا ناتوانی هیچم لەتەک بکەیت، چونکی تۆ بەو خەوشەم و بەو مەرجە منت کڕیوە و گەواهانیش گەواهیی ئەوەت لەسەر دەدەن {...}، ئەو خەوشەش ئەوەیە کە من هەموو ساڵێک درۆیەک دەکەم، جا ئەوەی کە کردم نیوە درۆیەکە، گەر ساڵ تەواو بکەم نیوەکەی تریشی دەکەم، ئیدی ئەوە دەبێتە درۆیەکی تەواو".

کافور، هەموو ساڵێک جارێک دووچاری قەیرانێک دەبێت ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت، دووچاری نۆبەیەکی توند یان دۆخێک دەبێت کە ناچاری دەکات درۆیەک هەڵببەستێت، بەڵام ئەو شتەی کە سەرنج رادەکێشێ، ئەوەیە کە ئەو بەجۆرێک رەفتار دەکات وەک ئەوەی ئەو بەسەرهاتەی کە دەیگێڕێتەوە راست بێت وا دەرناکەوێ کە خۆ وا دەربخات یان خۆ وا بنوێنێت، ناشتوانرێت بەدڵنیاییەکەوە بگوترێت کە ئەو تەواو بە ئاگایە لەوەی کە درۆ دەکات، چونکە تەنانەت کاتێک کە سەردارانی دەرک بە راستیی پرسەکە دەکەن، یانی سەروەختێک کە لە سەلامەتیی خۆیان دڵنیا دەبن، ئەو بۆ ساتێک هاوار دەکات و دەگری و خوڵ دەکات بە سەری خۆیدا وەک ئەوەی کە ئەوان بەڕاستیی مردبن، وەک ئەوەی ئەو رووداوەی کە دروستکراوە خودی راستیی خۆی بێت. ئەو، لێکدژییەکەش لەمەدایە، ویژدان تەندروست و لەگەڵ خۆ راستگۆیە سەروەختێک کە درۆ دەکات!

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە بەسەرهاتی کافور خراوەتە نێو بەسەرهاتێکی دیکەوە کە بابەتی ئەمیش هەر دیسان باس لە درۆ دەکات. پوختەی ئەو بەسەرهاتە باس لەوە دەکات کە زوبەیدەی خێزانی هارون رەشید لە (خۆرشتی دڵان)ی خانمی دۆستی خەلیفە دڵی پیس کرد، ئیدی لەکاتی لە ماڵ نەبوونی خەلیفەدا بێهۆشی کرد و فەرمانی بە هەر سێ بەندەکە دا، لەنێویشیادا کافور، تا بە زیندوویی لە دەرەوەی کۆشک زیندەبەچاڵی بکەن (ئەمەش خاڵی بەیەکگەیشتنە لەگەڵ بەسەرهاتی کافوردا کە گوتی گوایە گەورەکانی دیوار رما بەسەریاندا). پاشان فەرمانی بە

دارتاشێک دا تا وێنەیەک لە دار (لەسەر شێوەی نەوەی ئادەم) دابتاشێت، لەپاش ئەوە لەنێو کۆشکەکەیدا کفن و دفنی کرد. کاتێک کە خەلیفە لە گەشتەکەی گەڕایەوە، پێیان گوت خۆرشتی دڵان مرد، ئیدی ئەویش لەو ڕووداوە سەری سوڕما و لەنێوان بڕواکردن و بڕوانەکردن دۆشی داما، سەروەختێکیش کە دوودڵیی بەسەریدا زاڵ بوو فەرمانی دا بە هەڵکەندنی گۆڕەکە و دەرهێنانەوەی خۆرشتی دڵان، ئیدی کاتێک کە کفنەکەی بینی و ویستی لە سەری لا ببات تا چاوی پێی بکەوێت، ترسی خودای پەروەردگار کەوتە نێو دڵییەوە، بەو شێوەیە فێڵەکەی بەسەردا تێپەڕی[٢]... هەرچی خانمە دۆستەکەشە لاوێک کە ناوی غانمە لەو گۆڕە لە دەرەوەی شار کە تێیدا نێژرابوو، دەریهێنا و لە مردنی بێ چەند و چوون قوتاری کرد (ئەمە خاڵێکی دیکەی بەیەکگەیشتنە لەگەڵ بەسەرهاتەکەی کافوردا، کاتێک کە ئەوە دەردەکەوێت کە سەردارەکان زیندوون، بەم پێیە وەک ئەوەی لەژێر دار و پەردو هاتنە دەرەوە). بەوجۆرەش کە خوێنەری گیرۆدە بە خوێندنەوەی چیرۆکەکانەوە چاوەڕێ دەکات، غانم و خۆرشتی دڵان "دڵیان چووە یەکدی"، بەڵام هەر کات کە دەیویست بەسەرهاتەکەی بگێڕێتەوە، دەسبەجێ ترس و تۆقین دایدەگرت، چونکە پاش ئەوەی کە لە پێشدا پێی لێ دادەگرت دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات، دواتر "لە ترسی خەلیفە خۆی لێ دەگرتەوە". یانی، بە واتایەک لە واتاکان، بووە خەسێنراو. گەر کافور لەبەر ئەوە خەسێنرا، چونکە قسەی کرد، ئەوا غانم لەبەر ئەوە خەسێنرا، چونکە گوێی گرت. گێڕانەوەی بەسەرهات و گوێگرتن لێی پرسێکە هەمیشە ئاکامی باش نابێت[٣].

پێویست ناکات کە بشڵێین درۆکەی کافور هەرای نایەوە، هەموو شار خرۆشا، ئەو ئەو کەسەیە کە ئابڕوچوون لەسەر دەستی دەقەومێت. ڕەنگە ئێمە ئارەزووی درۆکردنی ئەو بە خواست بۆ تۆڵەسەندنەوە، بە ویستێکی شاراوە بۆ کوشتنی سەردارانی و لەناوبردنی کەلوپەلەکانیان ڕاڤە بکەین، بەڵام ئەو، پاڵپێوەنەرە شاراوەکانی هەرچییەک بن، مکوڕە لەسەر قایلکردنی سەردارە توڕەکەی لێی، بەوەی کە ئەو هەرگیز خەوشی خۆیی لێ نەشاردۆتەوە (یانی ڕاستیی خۆی لێ نەشاردۆتەوە!)، چونکە ئەو، لە دیدی خۆیەوە، ڕاستگۆیانە و سەرڕاستانە ڕەفتاری کردووە، هەربۆیە هیچ جۆرە هەستێک هەست بە گوناە ناکات و تۆبەکردنیش شتێکە لە بیری ئەودا نییە. درۆکردن لای ئەو کێشەیەکی مۆراڵیی بێدار ناکاتەوە، بەڵکو کێشەیەک لە

جۆرێکی ئیستاتیکیی بێدار دەکاتەوە گەر رەچاوی ئەوە بکەین کە درۆکردن لای ئەو شتێکی هاوشێوەی شاکارێکی هونەرییە، پێویستی بە ساڵێک لە ئامادەکاریی و ئامادەسازییە تا تەواو "کامڵ" بێت، ئەمەش ساڵنامەکانی زوهێر بن ئەبی سەلمامان دەهێنێتەوە یاد (کە لەنێو "بەندەی شیعر" دا پۆلێن کراوە)، کە ساڵێکی تەواوی لە دانانی چامەیەک و پوختەکردن و چاککردنیدا بەسەر دەبرد. کافوریش بەمەبەستی دابینکردنی کاتی پێویست بۆ تەواوکردنی شاکارەکەی، ئازادبوون لە کۆیلایەتیی رەتدەکاتەوە کە سەردارەکەی بۆی پێشنیاز دەکات تا لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و لە دەست درۆکانی رزگاری بێت: "سوێند بە خوا گەر تۆ ئازادم بکەیت، من ئازادت ناکەم، تا ساڵ تەواو دەبێت و نیوەکەی دیکەی درۆکە دەکەم، پاش ئەوەی کە تەواویشی دەکەم بمبە بازاڕ و بەو نرخە بمفرۆشە کە بە خەوشەکەمەوە داوتە بە هەقمدا".

ئەمە کاتێک روویدا کە "ساڵی نوێ هات"، ئەمەش لەنێو دەقەکەدا یەکسانە بە وەرزی بەهار ("ساڵێکی پیرۆزی پڕ پیت بوو بە رووەک"). وەکی چۆن سرووشت چرۆ و میوە بەرهەم دەهێنێت، کافوریش دەلەسە و درۆ بەرهەم دەهێنێت، بەجۆرێک کە بڕشتی ئەندێشەی ئەو بەرانبەرە بە پیتی زەوی و فرەیی رووەکەکانی.

لێرەدا دەپرسین و دەڵێین: داخۆ ئەم چیرۆکە کاریگەرییەک یان پاشماوەیەک لە نەریتێکی کۆن و بەسەرچووی لە خۆ نەگرتووە، نەریتی جارێک درۆکردن لە ساڵێکدا، لە سەرەتای مانگی نیساندا؟ بۆ وەبیرهێنانەوەش دەڵێین رۆژژمێری کۆنی رۆمانیی کتومت بەو مانگە دەستی پێ دەکرد! ئەم نەریتە (هیندۆ - ئەورووپیی)ەش مەبەست لێی ئاهەنگ گێڕان بوو بە بۆنەی ساڵی نوێوە، لای رۆمانەکان بە جەژنی دێوانەکان و گەمەکانی کەرنەڤاڵەوە وابەستە بوو[٤]. رەنگە لەنێو ئەم بەسەرهاتەی ئێمەشدا زایەڵەیەکی ئەو سرووتە هەبێت گەر رەچاوی ئەوە بکەین ئەو کاروانەی کە رووەو دەرەوەی شار، بەرەو بێستانەکە، بەرەو ئەو جێیە کە بە گوتەی کافور، سەردار و هاوەڵانی تێیدا گیانیان لە دەست دا، بە رێ کەوت، کە کاروانێکی سەرسوڕهێنە کەسانێک لە هەموو دەستە و تەمەنێک بەشدارییان تێدا کرد "رووخسار و سەریان پەتیی بوو". هەروەها رەنگە لەنێو ئەم سرووتەدا شرۆڤەیەک هەبێت بۆ ئەو مافی لەمەڕ درۆکردنەی کە کافور داوای دەکات شانبەشانی گوێ نەدانی بەو سزایەی کە دەشێ لە ئەنجامی ئەو کارەی بکەوێتەوە.

بەڵام سەردارەکەی بەو جۆرە تەماشای پرسەکان ناکات: "پاشان لە توڕەیی زۆریدا چووە لای والی ئیدی پێدا کێشانێکی توند لێیدام تا لەهۆش خۆم چووم، لەکاتی بێهۆشییمدا سەرتاشی هێنایە سەرم و خەساندمی و داخی کردم، سەروەختێک کە هاتمەوە هۆش خۆم تەماشام کرد خەسێنراوم و سەردارم پێی گوتم: وەک چۆن تۆ دڵمت سەبارەت بە ئازیزترین شتم ئاگر تێ بەردا، منیش دڵتم سەبارەت بە ئازیزترین شتت سووتاند". بەپێچەوانەی دوو بەندەکەی ترەوە کافور گوناهی داوێن پیسیی ئەنجام نەدا، خۆی رادەستی حەزێکی سێکسیی نەکرد، بەڵکو گوناهێکی زمانیی کرد، چونکە ئەوە زمانی بوو کە تووشی گوناهی کرد. هەڵبەت ئەو تەواو بە تەنگ ئەو ئەندامەی جەستەیەوەیە، چونکی گەر ئەو نەبووایە "خەوشەکەی" نەدەما، خەوشێکیشە کە ئەو دەستی پێوە دەگرێت و ئاگاداریی دەکات، ئەدی چۆن نا لەکاتێکدا کە ئەوە راستیی ئەو و کۆڵەکەی کەسێتیی و بوونی ئەوە؟ هەر ئەمەشە کە لە یادی سەردارەکەی چووە کە زمانی، ئازیزترین شتی، بۆ نەبڕیوە، بەم پێیە، کەواتە بەو جۆرەی کە پێویستە سزای نەداوە و سزادانەکەی کەموکووڕە، کتومت وەکی چۆن درۆکەی کافوریش نیوە ناتەواوە.

لەنێو لێکۆڵینەوەیەکی لەوەوبەردا[٥] بەشێوەیەکی تایبەتیی دەربارەی ئەو چیرۆکە دووام و پرسیم داخۆ کافور، لەپاش خەساندنی، دەستی لە هەڵبەستنی درۆ ساڵانەکەی هەڵگرت؟ لەبەر هۆیەک لە هۆیەکانیش بڕوام وابوو کە ئەو، لەپاش ئەو نەشتەرگەرییەی کە بۆی کرا، تۆبەی کرد، بەتایبەتیی کە ئەو ددان بە رووخانی خۆیدا دەنێت ("رووخـام و ورەم دابەزی و گونم نەما")، بەڵام من لە پێشبینیکردن بە هەڵەدا چووم و بە باشیی تێبینیی دەقەکەم نەکرد، راستییەکەشی هەر وابوو، کافور بە هیچ جۆرێک ئەوەی نێو ناخی خۆی نەگۆڕی: "تا ئێستاش دووبەرەکیی لەو شوێنانەدا دەنێمەوە کە تێیدا دەفرۆشرێم". ئەو هەر بە خەوشەکەی خۆیەوە وابەستە بوو، گەرچی ئێمە هیچ زانیارییەکمان دەربارەی درۆکانی دواتری نییە لە ماوەی چوونی لەلای سەردارێکەوە بۆ لای یەکێکی تر، چونکە ئەو تەنها ئەو بەسەرهاتەی بۆ دوو بەندەکە گێڕایەوە کە هۆکاری "خەساندن"ی بوو. هەڵبەت دەشێ ئێمە دەربارەی ئەوە پرسیار بکەین، کە داخۆ ئەو لەو شتانەدا کە گێڕاونێتییەوە راستگۆ بووە؟ بە دەربڕینێکی تر، داخۆ ئەو درۆ ناکات سەروەختێک کە دەڵێت درۆ دەکەم؟ داخۆ ئەو بەسەرهاتەش کە بۆ

دوو بەندە خەسێنراوەکەی دەگێڕێتەوە هەر لە خواستی سالآنەی ئەو بۆ درۆکردن، سەرچاوەی گرتووە؟

**پەراوێزەکان:**

١ـ ألف ليلة وليلة، المطبعة العامرة العثمانية، الطبعة الثالثة، ١٣١١، ل١٢٣– ١٣٦.

٢ـ لەنێو چاپی فەرەنسیی ماردرۆس (پاریس، بلأوکراوەکانی رۆبێر لافۆن، زنجیرەی "بوکان"، ١٩٨٠، أ، ل٢٨٢)دا، ئەوە دەخوێنینەوە کە خەلیفە "وێنە دارینە بە کفن داپۆشراوەکەی بینی بە خانمی دۆستی تێیگەیشت".

٣ـ بڕوانە تزیڤیتیان تۆدۆرۆڤ، "پیاوان- بەسەرهاتەکان"، شیعرگەرایی پەخشان (بە زمانی فەرەنسیی)، پاریس، بلأوکراوەکانی لوسۆی، ١٩٧١، ل٨٧.

٤ـ ئەم زانیارییانەم لە هەندێک لە ئینسایکلۆپیدیاکانەوە وەرگرتووە.

٥ـ العين والإبرة، ترجمة مصطفى النحال، الدار البيضاء، نشر الفنك، ١٩٩٦، ل ١٨.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری (فکر ونقد)، ژمارە (٨).

# ئەفسانە و مێژوو



و. لە عەرەبییەوە: عەبدولباست ئەحمەد*

هەتا دەرکەوتنی ئەم مێژووەی ئەمڕۆ دەیناسین، ئەفسانەکان لای سەرجەم نەتەوەکانی دونیا بوونیان هەبووە و هەر ئەفسانەکانیش مێژووی ئەو نەتەوانە بوون، تەنانەت مێژووی ئاساییشیان نا، بەڵکو مێژووی پیرۆزیان بووە. لەو ڕۆژگارەدا تەنیا ئەفسانەکان خاوەنی گرنگی و بایەخ بوون، چونکە خواوەندەکان لە سەردەمە دێرینەکاندا دروستیانکردوون. پاش کۆتاییهاتنی چەرخی سەرەتایی، کۆمەڵگای مرۆڤ بەرەو شارستانییەتی "کشتوکاڵیی کۆن" چوو، بەڵام لەگەڵ ئەو گۆڕانەدا ئەفسانەکان نەتوانەوە و نووسینە مێژووییەکان جێگەی ئەوانیان نەگرتەوە، زۆرێک لە ئەفسانەکان -ئەگەرچی لەشێوە و فۆرمی جیاوازیشدا بێ- هەر بە زیندوویی مانەوە و بگرە هەندێک لەوانە تا ڕۆژکاری ئەمڕۆ هەر ماون. دوای داهاتنی نووسین ئەفسانەکان زیاتر لە جارێک نووسرانەوە و کۆپیی زۆریان لێ دروستکرا و دەستکاری و گۆڕانی زۆریان بەسەردا هات، بە ڕادەیەک هەندێکجار کۆپییەکە هیچی لە ئەسڵییەکە نەدەچوو.

با بۆ نموونە ئەفسانە گریکییە کۆنەکان وەربگرین کە زۆربەی خەڵک پێیان ئاشنان، ئەو ئەفسانانە زۆر زیاتر بە کاری ئەدەبی ئەژماردەکرێن تا ئەفسانە وەک نموونەیەکی سەرتایی، زۆرێک لە گێڕەرەوە(چیرۆکخوان)، فەیلەسوف و شاعیرەکان پێش تۆمارکردنیان چەندینجار دایانڕشتوونەتەوە تا بەم بەرگە نوێیەی کە ئێستا پۆشیویەتی گەیشتۆتە دەستی ئێمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ هەموو چیرۆک و رۆمان و حەکایەتە کۆنەکاندا جیاوازە و لە ناویاندا دەناسرێتەوە. رەنگە هەر کەسێک کە ئەم ئەفسانانە دەخوێنێتەوە پرسیاری ئەوە لە خۆی بکا کە" ئایا ئەو شتانەی لێرەدا هاتوون راستن؟ تۆ بڵێی بەڕاستی مەخلوقێک هەبووبێ نیوە مرۆڤ و نیوە ئەسپ؟ ساتیرۆس، حۆرییەکان؟ ئایا بەراستی مرۆ توانیویەتی خۆی بکات بە گوڵ یا درەختێک؟ ئایا خواوەندەکان لەسەر چیای (ئۆلیمپ) ژیاون و جار نا جارێکیش هاتوونەتە خوارەوە بۆ ناو مرۆڤەکان؟ ئایا بەڕاستی ئەسینا لەسەری(زیۆس)ەوە هاتۆتەدەر کاتێک هێفستۆس بە تەورێک لەتیکرد؟

ئێمە بە ئەگەرێکی زۆرەوە وای بۆ دەچین کە ئەو کەسەی ئەم پرسیارانە لە خۆی دەکات نازانێ کە بە وروژاندنی ئەم پرسیارانە مەسەلەیەکی زانستی گرنگی لەبەردەم خۆیدا کردۆتەوە، کە تا ئێستا زیاتر لە نەوەیەکی زانایانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە و هەموو نەوەیەکیش لەو زانایانە تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لەمەڕ ئەفسانەکانەوە خستۆتەڕوو، چونکە ئەفسانەکان بە یەکێک لە ئاڵۆزترین دیاردە کلتورییەکانی مرۆڤ دادەنرێن، هەموو نەوەکان تیۆریی یا تیۆرییەکانی خۆیان لەو بارەوە پێشکەشکردووە، لە ئەنجامی ئەمەشدا هێڵێکی بێکۆتایی لە تەئویلات(تأویلات) هاتۆتە کایەوە. زانای روسی (ی.گ.کاگارۆڤ) لەم بارەوە دەڵێ: (( هیچ زانستێک هێندەی مێتۆلۆجیا گریمانە و بۆچوونی تێدا بڵاو نییە)) بەڵام هەرچەند ئەو رێگایانەی کە زاناکان بۆ تێگەیشتنی ئەفسانە خستویانەتە روو زۆر و جۆراوجۆر بن، هەڵویستی ئەوان جیاوازییەکی جەوهەری دەبێ لەگەڵ هەڵوێستی ئەو کۆنینانەی کە لە دونیای ئەفسانەکاندا ژیاون، بەو پێیەی دونیای یەکەمینیان -دونیای (دایک) بووە بۆ ئەوان. ئەوان(مرۆڤی کۆن) باوەڕیان بە ئەفسانە هەبوو و دیراسەیان نەدەکرد، تێدا دژیەکی و وەهم و گێلێتیان نەدەبینی، لە ڕوانینی ئەوانەوە ئەفسانە واقعێکی راستەقینەی ئەوتۆ بوو کە هیچ واقیعێکیتر رەتی نەدەکردەوە و، هەموو ژیانیان لە ئەفسانەدا دەگوزەراند، بە هاوکاری ئەفسانەش دونیای دەروبەری خۆیان ئەزموون دەکرد، هەوڵیان دەدا لە رێی ئەوەوە لە چییەتیی ژیان بگەن و بە وشە و دەنگ و وێنە و رێگای تری

جۆراوجۆر گوزارشتی لێ بکەن.

مرۆڤە کۆنەکان لە ئەفسانەکاندا داهێنانێکی وەهمی یا پوچێتییەکی خەیاڵیی دوور لە عەقڵیان نەدەبینی کە بچێتە ژێر باری لێکدانەوەوە. زانای رووسی (أ.ف.لوسێف) کە هەموو ژیانی بۆ دیراسەکردنی ئەفسانە گریکییەکان تەرخانکردبوو، لە سەردەمی خۆیدا ئاماژەی بەوە داوە کە ئەفسانە زانستی و پڕ بزاوتە و بە داهێنانێکی وەهمی دانانرێ، بەڵکو ئاستێکی پێویستی تێگەشتن و واقیعە و ((بەرهەمێکی هەستەکی و بەرجەستەی واقیع))ە.

کۆنینەکان هیچ رۆژێک لە رۆژان پرسیارەکانی ئێمەیان لە خۆیان نەدەکرد: لە ئەفسانەکاندا کامە راستە و کامە نا ڕاست؟ ئەوان ئیمانێکی تۆکمە و ڕەها و بێسنووریان بە دروستی ئەفسانەکان هەبوو، هەر شتێک ئەفسانە باسی دەکرد، بەلای ئەوانەوە حەقیقەتی تەواو بوو. ئەم بڕوایەی ئەوان لەوەوە نەهاتووە کە ئەوان گێلن و ئێمە لەوان زیرەکترین، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە بۆ ئەوان ئەفسانەکان ئەو رێگایەیان دەکێشا کە دەبوو لە ژیاندا بیگرنە بەر.

نزیکترن نموونە یا هاوشێوەی ئەفسانە لەم سەردەمەی ئێمەدا شیعری کلاسیکییە، لەکاتی خۆیدا (ماندلشتام) ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم جۆرە شیعرە بەو جۆرە لێی تێدەگەین کە ئاستێکی ناچارکردنی تێدایە و بەو واتایەی تێیدا (مودی فرماندانێکی روون) دەبینرێ. شیعری کلاسیکی ((شتێکە دەبێت هەبێت، نەک بووە و تەواو بووە)).

هەر لەم بوارەدا توێژەری مەیدانی کلتورە کۆنەکان و میتۆلۆجیا( فرێدنبرگ) نووسیویەتی ئەفسانەکان بە نسبەت کۆنینەکانەوە ((گورزارشتکردنە لەو تاکە مەعریفەیەی کە پرسیار لە دروستی بابەتی دەرککردن ناکات، هەر بەو هۆیەشەوە دەگەیشتە ئەو پەڕی))

هەروەها لە سەردەمی کۆندا پرسیار لەوە نەدەکرا کە کێ ئەفسانەکانی دروستکردووە، پێیان وابوو کۆنترەکان ئەفسانەکانیان گواستۆتەوە بۆ مرۆڤ و ئەوانیش لە خواوەندەکانەوە وەریان گرتوون. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەفسانەکان سروش (وەحی) سەرەتایان تێدایە و لەسەر خەڵکیش پێویستە لە یادەوەری نەوەکاندا بیهێڵنەوە، بێ ئەوەی هەوڵ بدەن بیگۆڕن یا شتی نوێی بهاوێنە سەر، خواوەندەکان بە رای مرۆڤی کۆن بوونەوەری تەواو راستەقینە بوون، هەر لەبەر ئەمەشە کە هیچ پاڵنەرێک نەبووە کە شک لەم راستییە بکەن.

لە چیرۆکە ئەفسانەییەکاندا ئەزموون و مەعریفەی چەندین نەوە کەڵەکە بوون، ئەفسانە بۆ ئەوان (مرۆڤی کۆن) وەک ئینسکلۆپیدیایەک بووە کە تێیدا

وەلامی پرسیاری گرنگترین بوارەکانی ژیانیانی تێدا دەست دەکەوت، ئێمەش کاتێک دەمانەوێت ئەو وەلامانەمان دەستکەوێت ئەوا لە مێژوودا بۆیان دەگەڕێن، بەلام ئەوان لە ئەفسانەدا بۆی گەڕاون و هەر لەوێشدا دەستیان کەوتووە.

ئەفسانەکان دەربارەی کۆنترین سەردەمی مێژووی مرۆڤایەتیمان بۆ دەگێرنەوە، کە بوونی ئەو سەردەمە پێش بوونی هەموو زەمانەکان دەکەوێت، ئەمەش تەنیا مێژوویەک نییە، بەڵکو سەردەمانێکە کە بێژمار کاتی بەسەردا تێپەڕیوە: زەمەنی خەلْقی یەکەم. ئەو کاتە سەردەمێکی پڕ لە ڕووداو و کارە سەرەتاییەکانی خواوەندەکان بووە، هەر ئەو کاتەش سەرچاوەی دەسپێکی هەموو بوونەوەری ئێستایە، هەر لەو زەمەندا زەوی دروست کرا، هەرچیش لێی دێتە دەر و هەرچیش لەسەری دەژی، واتە لەو کاتەدا سیستەمێکی گەردوونی دیاریکراو هاتە دی، هەر ئەوەش بۆ مرۆ مایەوە کە پارێزگاری لێ بکا، بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش بەشێوەی پێویست، دەبوو پابەندی ئەو شتانە بن کە لە ئەفسانەکاندا هاتوون و ئەو سرووتانە ئەنجامبدەن کە لەگەڵ ئەفسانەکاندا هاتوون، بە واتایەکی تر لەسەر مرۆڤ پێویست بوو ئەوە دووبارە بکەنەوە کە خواوەندەکان کردوویانە. کەواتە ئەفسانەکان تەنیا چەند داهێنانێکی زیندوو نەبوون، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا چەند نموونەیەکی خوایی بوون تا مرۆڤەکان دووبارەی بکەنەوە. ئایا لەوە زیاتر چی گرنگی بە ژیانی مرۆڤ دەدا کە لەگەڵ خواوەندەکاندا هاوبەشی ژیانیان بکەن؟ بەمشێوەیە مرۆڤەکان مێژووی خۆیان لە ڕێگەی درێژەدان بە مێژووی پیرۆزی خواوەندەکان دروستکردووە. هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەفسانە پێش مێژووی هەموو ئەو نەتەوانە کەوتووە کە دەیان زانین: ئەوانەی کە ماون و ئەوانەش کە لەناوچوون.

**سەرچاوە:**

سحر الأساطير (دراسة في الأسطورة–التاريخ–الحياة)، م.ف.ألبيديل، ت: د.حسان ميخائيل اسحق، منشورات دار علاءالدين، دمشق،۲۰۰۸.

*abdlbasit@gmail.com

# ڤانکا

**ئەنتۆن چیخۆف**

**و. لە فارسییەوە: ئازاد نەجم**



کوڕیژگەیەکی تەمەن نۆ ساڵەیان بەنێوی (ڤانکا ژۆکـۆف)، لەسێ مانگ لـەوەوبـەرەوە بە شـاگـردی نـاردبـووە لای (ئەلیاخین) ی سـەڕاف. لەشەوی سەری ساڵی لەدایک بوونی مەسیحدا خەوی لێ نەدەکەوت. چاوەڕوانبوو تا وەستاکەی لەگەڵ ژن و منداڵ و کرێکارەکانیدا، بۆ نزای شەوی جەژن لەماڵێ وەدەرکەوتن و چوونە کڵێسا. دوای ڕۆیشتنی ئەوان شوشەیەک مەرەکەب و قەڵەم و سەر قەڵەمێکی ژەنگگرتووی وەستاکەی دەرهێنا و کاغەزێکی نوشتاوەی لێک کردەوە و بەرلەوەی دەست بەنوسین بکات، بەحاڵەتێکی تێکەڵ بەترسەوە سەرنجێکی دایە دەرگاو پەنجەرەکان و چەندجارێک لەو شەمایلەی - کە لە نێوان دو تاقچەی پڕ لەقاڵبی پێڵاو - بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو، ورد بۆوە و ئاهێکی قوڵی پڕ لەخەمی هەڵکێشا و لەسەر ئەو پارچە کاغەزەی کە لەسەر

نیمکێتەکە پانی کردبۆوە و خۆشی لەسەر زەویەکە چۆکی دادابوون و بەسەریدا نوشتابۆوە، دەستی کرد بەنوسین: (باپیرەی خۆشەویستم کۆنستانتین ماکاریچ! ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنوسم، جەژنی لەدایک بوونی مەسیحت پیرۆز بێت، خودا هەموو هیوا و ئارەزوەکانت بەدیبێنێ، خۆ من نەباوکم هەیە نەدایک! تۆ هەموو کەسێکی منیت!).

لە پەنجەرە تاریکەکە - کە بلێسەی رووناکایی مۆمەکە بەسەریەوە سەمای دەکرد - وردبۆوە و لەودەمەدا، روخسار و شێوەی (کۆنستانتین ماکاریچ) ی باپیری – کە شەوانە ئێشکی لە ماڵی (ژیوارۆف) دەگرت - هێنایە بەرچاوی خۆی.

باپیری ڤانکا، پیرەمێردێکی شەست و پێنج ساڵەی کورتەباڵا و رەقەڵەیە، بەڵام لەهەمان کاتدا گورج و بەڕاپەڕ بوو، چاوانی خومار و هەمیشە دەم بەخەندە بوو. شەوانە، ئێشکی لەماڵی (ژیوارۆف) دەگرت و بەڕۆژەوەش لە ئاشپەزخانەکە دەنوست، یان سەری دەخستە سەر کارەکەرەکان و دەیکردە گاڵتە و پێکەنین.

شەوانە، پاڵتۆیەکی لەچەرم دروستکراوی دەڵبی لەبەر دەکرد و بەدەوری باخچە و خانوەکەی ماڵی ژیوارۆفدا دەخولایەوە و بە (دار خەبەر*)ەکانی دەستی، دەنگە دەنگ و تەقە تەقێکی زۆری وەڕێ دەخست.

دوو دانە سەگ، کە یەکێکیان پیر بو و نێوی (کاشتانکا) و ئەوەی تریان کە سەگێکی ڕەش و درێژ بوو، هەرکاتێ مرۆڤ چاوی پێبکەوتایە جانەوەری (ڕاسۆ*) ی وەبیردەهاتەوە و بەو هۆیەوەشەوە نێویان لێنابوو (ڤیۆن)، هەمیشە بەدوایەوە بوون.

ڤیۆن، سەگێکی بەوەفا و گوێڕایەڵ بوو ، لەگەڵ کەسانی نامۆ و غەریبەشدا بەهەمان ئەندازەی خۆمانەکان، گوێ لەمست بوو. هەربۆیە هیچ کەس نرخ و بایەخێکی ئەوتۆی بۆ دانەدەنا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەتوێی ئەو گوێڕایەڵی و میهرەبانیەیدا، چەپەڵی و حەرامزادەییەکی شاراوە، بەدی دەکرا. هیچ سەگێک بەئەندازەی وی نەیدەتوانی لە کاتوساتی خۆیدا، درانە هێرش بەرێ و گاز لەقاچ و قولی خەڵک بگرێ، یان شتێک لە گەنجینەی ماڵێ برفێنێ، یان مریشکی موژیکێک بدزێ، چەند جارێک دارکاریەکی باش کرابوو، هەفتە نەبوو نەکەونە گیانی و تا نیوە گیان دەبوو تێلا ترێنی نەکەن، بەڵام دوبارە گیانی وەبەر دەهاتەوە و برینەکانی سارێژ دەبوونەوە و سەرلەنوێ قیت دەبۆوە.

ڤانکا، شێوە و ڕوخساری باپیری لەمێشکی خۆیدا وێنا کرد: کە لەنزیک دەروازەی باخچەکە ڕاوەستاوە و بەچاوانی خەواڵوەوە دەڕوانێتە پەنجەرە

سور و درەوشاوەکانی کڵێسای گوندەکە و چەکمە لبادیەکانی ئاڵوگۆڕ دەکات و سەرمایەتی و لەگەڵ کارەکەرەکاندا کەوتۆتە گاڵتە پێکەنین و کەشێکی خۆشی خوڵقاندوە و دارخەبەرەکانی بەکەمەریەوە کردون و لەسەرمان دەستەکانی لێک دەسوێ و وەک پیرەمێردان لەقاقای پێکەنین دەدا و جار جار کارەکەرەکە و جار جاریش ژنی چێشت لێنەرەکە، دەداتە بەر تانە و توانج و پیرەمێردانە لەقاقای پێکەنین دەدات. ئەمجا توتنەکەی دەنێتە بەرلوتی ژنەکان و دەڵێ: تۆزێک بۆنی ئەم توتنە بکەن گەرم دەبنەوە.

ژنەکانیش بۆنی دەکەن و دەکەونە پژمین. باپیرەش شاگەشکە دەبێ و لەقاقای پێکەنین دەدات و هاوار دەکات: ورچ زا.

دواتر قتوی توتنەکەی دەخاتە بەرلوتی سەگەکان و کاشتانکا پژمین دەیگرێ و لمۆزی وەردەگێڕێ و بەڕەنجاویەوە لەباپیرە دوردەکەوێتەوە. بەڵام ڤیۆن بەهۆی بەوەفاییەکەیەوە بەر بەپژمینی خۆی دەگرێ و تەنیا هەندێک دەمولمۆزی ڕادەوەشێنێ. کەش و هەوایەکی خۆشی هەیە، دونیا ساف و ئارام و ساردە، شەوێکی تاریکە و درەختەکان بە بەفر داپۆشراون، سەرانسەری سەربانی خانوەکانی گوندەکە، بەفر داپۆشیون و دوکەڵ لە لولەی سۆبەکانەوە بەباقە دێنە دەرێ و پێچ دەخۆن و بەرەوە ئاسمان هەڵدەکشێن. ئاسمان، یەک پارچە ئەستێرەیە و بەشادیەوە دەتروسکێنەوە. ڕێگای کاکێشان، هێندە ڕوونە دەڵێی بەر لە جەژنی کریسمس، بەبەفر شوشتویانە و وەبریسکەیان خستووە...

ڤانکا، ئاهێکی هەڵکێشا و سەری قەڵەمەکەی لەمەرەکەبەکە هەڵکێشا و دەستی کردەوە بەنوسین: (دوێنێ لێیاندام، خاوەن کارەکە بەپرچ ڕایکێشامە نێو حەوشەکە و بە قامچیەکی چەرم هەموو لەشی شین و مۆر کردمەوە، تەنیا تاوانم ئەوە بوو بەدەم ڕاژەندنی لانکی منداڵە پیسەکەیانەوە، خەوم لێکەوتبوو. هەفتەیەک لەمەوبەریش ژنەکەی پێی گوتم ماسی بۆ خاوێن بکەمەوە و منیش نەمزانی و لەدەمیەوە دەستم بە پاککردنەوەی کرد، ئیدی ئەوەبوو ماسیەکەی لەدەستم دەرهێنا و کێشای بەسەرمدا. شاگردەکانیش سەر دەنێنە سەرم و گاڵتەم پێدەکەن. دەمنێرن ڤۆدکایان بۆ بکرم و زۆرم لێدەکەن لەماڵی وەستاکەمان خەیارشۆریان بۆ بدزم. وەستاکەشم، بەهەرچیەکی بکەوێتە بەر دەستی دەستم لێناپارێزێ و دەکەوێتە وێزەم. نان و ژەمەکانیش ئەوە هیچ! بەیانیان پارچەیەک نان، نیوەڕۆیان شیربرنج، دوا نیوەڕۆیانیش پارچەیەک نان، باسی چای و ئاو گۆشتیش هەر مەکە! ئەمە تەنیا خواردنی خۆیانە و خۆیان قوزەڵەقورتی دەکەن. شەوانە جێگام لەدالانەکە بۆ ڕادەخەن. کاتێ منداڵەکەیان دەگری، دەبێ بچمە

سەری و لانکەکەی ڕاژێنم. خەوم هەر نییە! بابەگەورە تو خودا بەزەییت پێمدا بێتەوە و بمبەرەوە بۆ گوندەکەی خۆمان، بمبەرەوە بۆ ماڵ، ئیدی لەتوانامدا نەماوە... قاچەکانت ماچ دەکەم! تکاکارم لەخودا ئاگادارت بێت، لێرە رزگارمکە، دەنا چیتر لەتوانامدا نەماوە و دەمرم).

ڤانکا، بە بەری دەستە ڕەش و چڵکنەکەی، چاوەکانی پاک کردنەوە و ئاهێکی هەڵکێشا و بەدەم هەنسکی گریانەوە، درێژەی بەنوسیندا: (توتنت بۆ ورد دەکەم، نزات بۆ دەکەم، ئەگەر کارێکی خراپم کرد، تادەتوانی لێمدە! ئەگەر پێشت وایە لەوێ کارێکم وەگیر ناکەوێ، دەچمە لای پێشکارەکە و بەخودا و بەمەسیح سوێندی دەدەم تا پێڵاوەکانی بۆ بۆیاغ بکەم، یان لەبری (فیدکا) دەچمە لای شوانەکان و لە لەوەڕاندنی مەڕەکاندا یارمەتیان دەدەم. بابەگەورەی خۆشەویستم! ئیدی من توانام نەماوە... خەریکە دەمرم... جاری وایە دەڵێم بڕۆم هەڵێم و خۆم رزگارکەم و خۆم بگەیەنمەوە گوند، بەڵام پێڵاوم نییە، زۆر لەو سەهۆڵبەندان و بەستەڵەکەش دەترسێم، هەرکاتێ گەورەش بووم وەڵامی ئەم چاکەیەت دەدەمەوە و بەخێوت دەکەم و ناهێڵم کەس ئازارت پێبگەیەنێ. دوای مردنیشت نزای بەخێرت بۆ دەکەم، وەک ئەو نزایانەی کە بۆ پێڵاگێیای دایکم دەیانکەم. ئەگەر لەبارەی مۆسکۆشەوە دەپرسی، مۆسکۆ زۆر گەورەیە، تەواوی خانو و باڵەخانەکانی ئاغایانەن. ئەسپێکی یەجگار زۆری لێیە، بەڵام مەڕت بەرچاو ناکەوێ. سەگیشی زۆر لێن، بەڵام بێ ئازارن و گاز لەکەس ناگرن. لێرە منداڵان لەشەوی جەژندا بۆ کۆکرنەوەی پارە بەکۆڵاناندا ناگەڕێن. لەنێو کڵێساشدا غەریبەکان بۆیان نییە خۆیان تێکەڵی گروپی ئاوازخوێنەکان بکەن. ڕۆژێکیان لێرە، لەپشتی شوشەی دوکانێکەوە جۆرە قولابێکی ماسی گرتنم بینی بە دارەکەیەوە دەیانفرۆشت کە بۆ گرتنی هەموو جۆرە ماسیەک دەشیا، بەهێز و قایم. تەنانەت قولابێکم بینی کە دەکرا ماسی (ئەسبلا) ی سێ مەنیی پێ بگریت. دوکانی واشی تێدایە جۆرەها تفەنگی فرۆشتنی تێدا دەفرۆشرێ. تەنانەت وەک تفەنگەکانی ئاغای دێیەکەی خۆشمانی لێیە. کە لەوانەیە نرخی هەریەکێکیان سەد ڕۆبڵ بێت... لەدوکانی گۆشت فرۆشەکانیشدا هەرچی گۆشتێکی تۆ دەتەوێ لێیەتی ، لەگۆشتی کەڵەشێری قەرەجە گەڕۆکەکانەوە بگرە تا گۆشتی سوێسکە و کەروێشک، بەڵام گۆشتفرۆشەکان شوێنی ڕاوکردنیان بەکەس ناڵێن... بابەگەورەی خۆشەویست، لەماڵی ئاغای دێیەکەی خۆمان، کاتێ درەختی جەژن دەڕازێننەوە، بیرت نەچێ گوێزێکی زێڕین لەدرەختەکە بکەرەوە و لە سندووقە سەوزەکەی خۆتدا بۆم بشارەوە. بەخانمە بچکۆلە (ئۆلگا ئیگناتیوڤنا) بڵێ کە ئەو

گوێزەت بۆ منە).

ڤانکا، ئاهێکی خەمناکی هەڵکێشا و جارێکی تر چاوی بڕیە پەنجەرەکەو بیری کەوتەوە کە هەموو جارێ باپیری بۆ هێنانی درەختی کریسمس دەچووە نێو جەنگەڵ و ئەویشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. چ رۆژگارێکی خۆش بوو! هەم دەنگی باپیرە دەبیسترا و هەم بەفر لەژێر پێیدا دەکەوتنە قرچەقرچ، هەم ڤانکاش لەخۆشیان هاواری دەکرد. باپیرە بەرلەوەی دار کاژێک بۆ درەختی کریسمس ببڕێتەوە، قەنەیەکی ساز دەکرد، ماوەیەک بۆنی بەتوتنەکەوە دەکرد و پێکەنینی بە ڤانکا دەهات - کە لەسەرمان دانەچۆقەی پێکەوتبوو. کاژە تازە هەڵچوە بەبەفر داپۆشراوەکان، چاوەڕوانبوون ئاخۆ لەونێوەدا کامەیان بەزەویدا دەدرێ و دەبڕدرێتەوە. لەناکاو کەروێشکێک لەپەنایەکەوە لەنێو ئەو بەفرەدا دەردەپەڕی و... بابەگەورەش دەیکردە هاتوهاوار بەدوایدا: بیگرە... بیگرە... ئەی شەیتانی کلک بڕاو!

دواتر دارکاژە بڕاوەکەی بەڕاکێش ڕاکێش دەهێنایەوە ماڵی ئاغا و دواتر دەکەوتنە رازاندنەوەی. ئۆلگا ئیگناتیۆڤناش - بوونەوەرێک کە ڤانکا لەهەمووان زیاتر هۆگری ببوو - بۆ جوانکردنی درەختەکە لەهەمووان زیاتر پێوەی ماندوو دەبوو. ئەو کاتەی کە هێشتا دایکی ڤانکا نەمردبو و لەماڵی ئاغادا کارەکەری دەکرد، ئۆلگا هەمیشە ئاونەباتی دەدایە و هەر لەو سەروبەندەشدا بوو لەبەر بێکاری، فێری نوسین و خوێندنەوە و ژماردن هەتا سەد و تەنانەت فێری سەمای کادریشی کرد. ئیدی ئەوەبوو دوای مردنی دایکی، ڤانکایان بۆ ژووری خزمەتکارەکان، بۆ لای باپیری رەوانە کرد و دواتریش لەوێوە رەوانەی لای ئەلیاخینی سەڕافیان کرد لە مۆسکۆ...

ڤانکا، دەستی بەنوسین کردەوە: ( باپیرەی خۆشەویست! توخوا وەرە بۆ ئێرە و رزگارمکە! تۆ پیرۆزیی مەسیح وەرە و رزگارمکە! بەزەییەکت بەمنی هەتیوی کەساسی بەدبەختدا بێتەوە، رۆژ نییە دارکاریم نەکەن! خەریکە لەبرسان دادەهەزێم! ئەوەندە دڵم پڕە لەباسکردن نایەت، بەردەوام دەگریم! لەم رۆژانەدا وەستاکەم قالبێکی پێڵاوی کێشا بەسەرمدا، کەوتمە سەر زەوی، ئاگام لەخۆم بڕا، بەزۆر چاوی خۆمم کردەوە. ژیانم زۆر ناخۆشە، ژیانی سەگ زۆر لەژیانی من خۆشترە... سڵاوم بگەیەنە بە (ئێلینا) و (یوگۆرکا) ی یەکچاو و گالیسکەڕانەکە. مەهێڵە کەس دەستکاری ئۆکۆردیۆنەکەم بکات. نەوەی خۆت/ ئیڤان ژۆکۆڤ. توخودا زووتر وەرە و رزگارمکە).

ڤانکا ، دوای ئەوەی نامەکەی نوسی، قەدی کرد و نوشتاندیەوە و کردیە ناو ئەو زەرفەی کە رۆژی پێشتر بەکۆبیکێک کڕیبوی... دوای کەمێک بیرکردنەوە، سەری قەڵەمەکەی تەڕ کرد و ناونیشانەکەی لەسەر نوسی: بگاتە خزمەتی بابەگەورەم لەگوند... دواتر سەری خوراند و هەندێک بیری کردەوە و لێی زیاد کرد: کۆنستانتین ماکاریچ.

زۆر خۆشحاڵ بوو لەوەی کە هیچ کەسێک لەوکاتەدا نەهات و نەبووە رێگر لەبەردەم نوسینی نامەکەی.

دواتر کڵاوەکەی کردە سەری و بێئەوەی پاڵتۆکەی لەبەرکات، بەکراسێکەوە، تا لای نزیکترین سندووقی پۆستە رایکرد...

شەوی رابردوو، پرسیاری لە شاگردەکانی قەسابەکەی سەری کۆڵانەکە کردبو و ئەوانیش وەڵامیان دابۆوە و گوتبویان دەبێ نامە بخرێتە سندووقی پۆستەوە و پاشان چەند تەتەرێک سندووقەکان دەکەنەوە و بەسواری (ترۆیکا*) ی زەنگوڵەدارەوە، ئەگەر تا ئەوسەری دونیاش بێت، نامەکە دەبەن و دەیگەیەننە دەستی ئەو کەسەی کە بۆی رەوانەکراوە.

ڤانکا، بــەرەو یەکەمین سندووقی پۆستە رایکــرد و نامە بەنرخ و خۆشەویستەکەی لەدرزی سندووقەکەوە ئاودیو کرد...

کاتژمێرێک دواتر، بەئاوازی لایلایەی ئومێدێکی شیرینەوە، چووە نێو خەوێکی قوڵەوە...

لەخەونیدا: بابە گەورە لەسەر کوانویەکی بەخشتی سور دروستکراو، دانیشتبو و قاچە رووتەکانی شۆڕ کردبوونەوە و نامەکەی ئەوی بۆ کارەکەرەکان دەخوێندەوە... ڤیۆنیش بەتەنیشت کوانوەکەدا دەهات و دەچو و کلکی دەلەقاند...

(*دار خەبەر): دارێکە لەشێوەی کەوچک، پاسەوان و ئیشکچیەکان، جار جار شەوانە دەنگە دەنگێکی پێ دروست دەکەن.

(*راســۆ): مشکی خورما، گیانەوەرێکی گوانداره، لەمشکی ماڵ گەورەترە، رەنگی خۆڵەمێشیەکی تێکەڵ بەزەردە، دەم و لمۆزێکی باریک و درێژی هەیە، لەئاسیا و ئەفریقا و بەتایبەتی هیندستان زۆرە.

(*ترۆیکا): خێشکێکە بە سێ ئەسپ رادەکێشرێ.

**سەرچاوە:**

مجموعە اسار چخوف، داستانهای کوتاه، ترجمە: سروژ استپانیان، انتشارات توس.

لە ئەدەبی ئەفریقاوە
حکایەتی بەرئاگردانی ئەفریقی

# ئەو پادشایەی کە دەیویست هەموو پیرەکان بکوژێت



نووسینی : ئەمەدو هامپاتێ با*
و. لە فەرەنسییەوە: ئاوات حاجی عەبدوڵڵا هەورامی

لەناوجەرگەی شانشینی تولا هێلاوە، لە یەکێک لە ناوچە شاخاویەکانی برۆس، رۆژێکیان پادشا دەمرێت. بۆنکی تاقانە کوڕی پادشا، جێگای باوکی دەگرێتەوە، بەڵام بەداخەوە زۆر گەنج و بێ ئەزموون دەبێت. ئەوەندە دڵی خۆش بوو بەم جێنشینیەی باوکی، بەشێوەیەکی هەرزەکارانە و بێ بەزەیی حکومی وڵاتی دەکردو بەبێ ئەوەی گوێ بۆ راوێژی پیرەکان بگرێت، هەروەک چۆن پێشتر نەریتی باو باپیرانی بووە، بەڵام ئەو، ئەو رێسایەی شکاند و تەنها یەک شتی دەویست ئەویش ئەوەیە، کە بە ئارەزووی خۆی حوکمی گەنجەکان بکات و هەموو شتێکیان بەسەردا بسەپێنێت و عەزابیان بدات. بەبێ ئەوەی یەکێک

بتوانێت دژی بوەستێتەوەو بڵێت لەل پێی و بوێرێت بڵێت: بەری چاوت کلی پێوەیە.

شەوێکیان پادشا گەنجەکەمان خەوێک دەبینێت و لە خەویدا پیرەکان یەک لەدوای یەک سەرەیان گرتووەو دژی هەڵسووکەوتە بێ ماناکانی ئەو ئامۆژگارییان دەکرد و ڕێگای باشیان پیشان دەدا. بۆ بەیانییەکەی پادشا گەنجەکەمان بریار دەدات، کە هەموو گەنجەکانی لادێکەی کۆبکاتەوەو داوایان لێ دەکات کە هەر کەسێک باوکی یان باپیری بکوژێت. ئەوەی بەلای پادشامانەوە گرنگە ئەوەیە کە، هەر گەنجێک پیری ماڵی خۆی بکوژێت. هەرکەسێکیش فەرمانی پادشا بەجێ نەهێنێت و پیرێک نەکوژێت، ئەو بێ قەیدوشەرت سەری دەبڕێت.

پادشامان دەڵێت:

دەمەوێت وڵاتەکەم وەکو سروشت وابێت، ڕێک وەکو بارانی زستان وابێت. کە گیاکانی سەوز و جوان بن، نامەوێت چیتر یەک گیای وشک و زەرد ببینم.

هەموو گەنجەکان بە قسەیان کرد، تەنها یەکێکیان نەبێت، کە بە قسەی نەکرد، ناوی تاسی بوو. زۆر زۆر پەیوەستبوو بە باوکە پیرەکەیەوە، زۆر سەرسام بوو بە حیکمەت و زیرەکی باوکی. شەو بێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بێت، باوکی لە ماڵە بچووکەکەی دەردەکات و بەناو گیا بەرزەکاندا باوکی دەبات و گیا بەرزەکان دەبڕێت بۆئەوەی کەس چاوی لێیان نەبێت و دەیگەیەنێتە ئەشکەوتێک لە قەدپاڵی گردێکەوە. لەوێ دایدەنێت و جێگای بۆ خۆش دەکات و نان وئاو و ئازووقە و خواردنی بۆ دابین دەکات، بەڵێنیشی پێ دەدات، کە هەموو شەوێک سەردانی بکات.

بۆ بەیانی پادشا هەموو گەنجەکان کۆدەکاتەوەو پێیان دەڵێت:

ئایا هەموو پیرەکان مردوون و هیچ پیر لە وڵاتی من نەماوە.

هەموو گەنجەکان بە یەک دەنگ دەڵێن:

بەڵی جەنابی خاوەن شکۆ، هیچ پیر نەماوە.

پاشان پادشا دەڵێت:

ئێستا داوای شتێکتان لێ دەکەم بۆ خودی خۆم:

دەمەوێت زینێک بۆ ئەسپە ڕەسەنەکەی خۆم، کە خۆتان دەزانن تەنها شیری مانگا ساحیلیەکان دەخواتەوە. دەمەوێت یەک زینم بۆ دروستبکەن، کە بە لمی ناسکی ورد چنرابێت. لەماوەی سێ ڕۆژدا دەبێت بۆم ئامادە بکەن، هەرکەسێک لەماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا نەیهێنێت، بە جەلادەکەم دەڵێم، سەری ببڕێت.

گەنجەکان هەموو سەریان سووڕماو دەستیانکرد بە بۆڵە بۆڵ و پرسیار

لەیەکترکردن و دەیانگووت:

چۆن دەتوانین لەماوەی سێ ڕۆژدا، دەتوانین زینێکی بەو شێوەیە دروستبکەین. بە دەزوو مورو زین دروستکراوە، بەڵام بە لمی ورد و ناسک، ئەمەمان نەبیستوەو بەکەسیش ناکرێت.

کێشەکە لەوەدایە، پادشا هەرشتێک بڵێت، دەیکات. دەگریان و دەپاڕانەوە و نەیاندەزانی چی بکەن، هیچ کەسێکیش چارەسەری لا نەبوو.

تاسی وەکو هەموو ئێوارەیەک کە نانی دەبرد و دەچوو بۆ لای باوکی. وازی هێنا هەتا باوکی نانەکەی بخوات. پاشان حکایەتەکەی بۆ گێڕایەوەو بە باوکی گووت:

پادشا بۆنکی دوای ئەوەی هەموو پیرەکانی کوشت، ئێستاش دەیەوێت هەموو گەنجەکان بکوژێت.

باوکی دەڵێت: ئەو سەرکردەیەی هەموو گەلەکەی بکوژێت، تەنها خۆی دەمێنێتەوەو دەبێتە پاسەوانی قەبرستان.

تاسی بە باوکی دەڵێت:

پادشا داوای ئەوەمان لێ دەکات، کە لەماوەی سێ ڕۆژدا زینێک لە لمی ورد و ناسکی بۆ دروستبکەن. هەر کەسێکیش دروستی نەکات، ئەوا پادشا دەیکوژێت.

باوکی تاسی دەڵێت:

کوڕی خۆم هیچ گوێی مەدەرێ. تۆ گوێتم بۆ شل بکەو باکەسیش نەزانێت، بەیانی کە چوویتەوە بۆ لای پادشا ئەمەی پێ بڵێ کە من ئێستا دەیچرپێنم بە گوێتا.

پاش سێ ڕۆژ ئەو هەموو گەنجە چاویان سووربوبوەوە، لەبێ خەوی و بێ دەسەڵاتی خۆیاندا کە نەیاندەزانی چی بە پادشا بڵێن، خراپ پەشۆکابوون.

پادشا دەڵێت:

ها، چیتانکرد، زینەکانتان بۆ چێکردم؟!

بێدەنگیەکی قووڵ باڵی بەسەر خەڵکەکەدا کێشابوو، کەس نەیدەوێرا قسان بکات.

پادشا گووتی:

تەنها هێندە کاتان دەدەمێ، کە دەجار چاوتان بترووکێنن. دوای ئەوە جەلادەکەم دەستدەکات بە کوشتنی یەک بە یەکتان.

تاسی هێز دەداتە بەر خۆیی و دەچێتە پێشەوە بۆ لای پادشا و پێی دەڵێت:

هۆ جەنابی خاوەنشکۆ، کە هاوتاتان نییە لە جیهاندا، ئەی ئەو کەسەی کە

خاوەنی ئەو ئەسپە رەسەنە سوورە شاهانەیەیە، کە بە شیری مانگاکانی ساحیل دەژی. ئێمە هەمووکاتێک خزمەتکارو بەندەی جەنابتانین، ئەی ئەوە نەبوو هەموومان بە یەک فەرمانی جەنابتان، باوکی خۆمانمان کوشت، هەرچی پیربوو لەم دەڤەرەدا قڕمان کرد. ئەگەر ئێمە زینەکەمان بۆ ئێوە نەکردووە، خۆ لەبەر ئەوە نەبووە کە ئێمە بێ ئەدەبی بکەین و بە قسەی جەنابتان نەکەین و دڵگرانتان بکەین، بەڵکو دەمانویست زینێکتان بۆ دروستبکەین،کە زینێکی شاهانە و شایانی جەنابتان بێت. لەبەرئەوە پێمان باشە کە جەنابتان زینە کۆنەکەتان، ئەوەی کە بە لمی ورد هۆنراوەتەوە، پیشانمان بدەیت، بۆئەوەی لێوەی فێربین و بەهەمان شێوە و لەوەش باشتر بۆتان دروستبکەین.

هەموو گەنجەکانی کەمێک هاتنەوە سەر خۆیان و هەناسەیەکی خۆشیان هەڵمژی.

پادشا هەستایە سەرپێ و بە تووڕەییەوە گووتی:

بڕۆن ملتان بشکێنن بەیانی وەرنەوە بۆ ئێرە.

بۆ رۆژی دوایی کە دەگەڕێنەوە، پادشا زۆر بە تووڕەییەوە دەڵێت:

دوێنێ هێندە ناجسن بوون، کارەکەتان نەکرد و واشتان لە من کرد، کە نەتوانم تاوانبارتان بکەم، بەڵام دڵتان هێندە خۆش نەبێت، واش بیرنەکەنەوە کە هەق بە هەقین.

پاشان پادشا بە تووڕەیەوە دەڵێت:

ئەمڕۆ داواتان لێ دەکەم، کە کۆشکێکم بۆ دروستبکەن، لە نێوان ئاسمان و زەویدابێت. پاش هەفتەیەکی تر، وەرنەوە. ئەوەی دروستی نەکردبێت، سەری دەبڕم.

گەنجەکان لە جارانی تر، زیاتر تێکشکان و نەیاندەزانی چی بکەن و بڵاوەیان لێکرد.

وەکو هەموو ئێوارەیەک، تاسی بە نهێنی دەچێت سەردانی باوکی بکات.

تاسی بە باوکی دەڵێت:

بابە ئەمڕۆ پادشا داوای لێکردین، کە کۆشکێکی بۆ دروستبکەین، کە لەنێوان ئاسمان و زەویدا بێت. باوکە وابزانم ئەمجارە بە تەواوەتی ماڵمان وێران بوو.

باوکی دەڵێت:

نا کوڕم، ئەمە هەر هیچ نییە، هەر گوێشی مەدەرێ. تۆ گوێتم بۆ بێنە پێش با پێت بڵێم چی بکەیت. هەر ئەوە بڵێ و هیچی تر.

بۆ بەیانی تاسی بە برادەرەکانی دەڵێت:
دوێنێ شەو من بیرێکم بۆ هاتووە، حەز دەکەم پێتان بڵێم، بەڵام من حەز ناکەم تەنها من قسەبکەم، نەوەکو پادشا بکەوێتە گومانەوە لێم، من پێم باشە کێ لە هەمووومان بە تەمەنترە ئەو قسە بکات و ئەم پێشنیارەی منی پێ بڵێت.
بەیانی زووی حەوتەم رۆژ، هەموو کورە گەنجەکان کۆبووبونەوەو پادشاش لە کۆشکەکەی خۆی دەردەچێت و دوو کۆیلەی چەکدار بە دوو باوەشێنی گەورەوە، باوەشێنیان دەکرد، بۆ ئەوەی مێش و مەگەز لە دەوری لابەرن و باوەشێنی پادشا بکەن بۆ ئەوەی فێنکی بێتەوە بەو قرچەی گەرمایە.
هاتە سەر سەکۆی پادشایانە و ئەمجارەیان دڵنیابوو کە گەنجەکان دۆڕاندویانەو بەئاسانی لەدەستی دەرناچن.
لەهەموویان بەتەمەنتر لە گەنجەکان هاتە پێشەوە وگووتی:
ئەی پادشای گـەورەمـان، ئێمە هەموو کەرەستەی کۆشکەکەمان بۆ ئامادەکردوویت و لەهیچمان کەم نییە، بۆ ئەوەی کۆشکەکەت بۆ دروستبکەین، تەنها شتێکام نووقسانە، ئەویش ئەوەیە کە جەنابتان بەردی بناغەی کۆشکەکەمان لە نێوان ئاسمان و زەویدا بۆ دانێیت، بۆ ئەوەی ئێمەش بزانین لە کوێوە دەست بەکاربین. بۆ ئەوەی ئێمەش کۆشکێکت بۆ دروستبکەین بە دڵی جەنابتان بێت بێ کەم و زیاد.
پادشا لەداخاندا تەقیەوەو تووڕە بوو، گووتی:
بڕۆن ملتان بشکێنن و بچنەوەماڵی خۆتان.
دوای چەند رۆژێکی تر پادشا کۆیاندەکاتەوەو پێیان دەڵێت:
بۆ ئەوەی سزاتان بدەم، بەیانی هەمووتان کۆببنەوە لە گۆڕەپانی گوندا. لە قرچەی نیوەڕۆدا، ئەوکاتەی کە خۆر لە تەپڵی سەری مرۆڤ و لە پەلی درەخت و لەکەللەی گیانداران دەدات، تەنانەت عەرزیش بەرگەی نەگرێت. با پێشتان بڵێم، هەموو جەلادەکانم لەگەڵ خۆم دێنم. بە جەلادەکانیشم گووتوە، گەر خۆرەتاو لەسەر سەرتان بێت ئەوا سەرتان دەبڕم، گەر لەژێر سێبەریشدا بن، ئەوا هەر سەرتان دەبڕن.
تاسی وەکو هەموو ئێوارەیەک دەڕواتەوە بۆ لای باوکی و حکایەتی پادشای بۆ دەگێڕێتەوەو پێی دەڵێت، کە داوای شتێکی وامان لی دەکات.
باوکی دەڵێت: هەر گوێی مەدەرێ رۆڵە. تۆ گوێچکەت بێنە، با من پێت بڵێم چی بکەن.
بۆ بەیانی هەموو گەنجەکان لەکات و عانی خۆیدا چوونە گۆرەپانەکەوەو

خۆیان خستە ژێر تۆڕی ماسیگرەکانەوە. ئەو تۆڕانەی کە وا دووراون، کە تیشکی خۆر پێیدا گوزەر بکات. لەژێر ئەو تۆڕانەدا، هەم خۆرەتاوە و هەم سێبەریشە.

پادشا کە دەگات و یەکسەر دەڵێت:

ئەها، ئەوە چییە خۆتان خستوتە ژێر سێبەر؟!

ئەوانیش دەڵێن:

نەخێر جەنابی پادشا ئێمە چۆن بێ ئەدەبی وا دەکەین، بەقسەی جەنابتان ناکەین، ئەوە نییە سەرمان خۆری بەسەرەوەیە.

ئەو شوێنەی سەریان پیشان دەدەن، کە تیشکی خۆری بەسەرەوەیە.

پادشا زۆر تووڕە دەبێت و پێیان دەڵێت:

باشە ئەمجارەش برتانەوەو لێی دەرچوون، بەڵام ئەمجارەیان هەروا بە ئاسانی لەدەستم دەرناچن.

پادشا بە تووڕەییەوە گووتی:

بەیانی وەرنەوە بۆ ئێرە، ئەوەی بە پێی بێت سەری دەبڕم، ئەوەشی بە سواری وڵاخ بێت، هەر سەری دەپەڕێنم.

پادشا هێندە تووڕە و بێ تاقەت بووبوو، زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت و ڕەوتە شاهانەکەی خۆی لەدەست دابوو.

تاسی دەڕواتەوە بۆ لای باوکی و حکایەتی پادشای بۆ دەگێڕێتەوە.

کەچی زۆر سەیر بوو، باوکی لەجیاتی ئەوەی تووڕە بێت یان بێ تاقەت بێت، دەستدەکات بە پێکەنین و بە کوڕەکەی دەڵێت:

ئەوەیان هەر زۆر کارێکی ئاسانە، ئاتۆ گوێچکەت بێنە با پێت بڵێم بەیانی چی بکەن.

گەنجەکانیش بۆ بەیانی هەر کەسەو سواری کەرێکی بچووک بوو، بەشێوەیەک کە قاچیان لە عەرزی دەداو لەهەمانکاتیشدا سواری وڵاخ بوو بوون. بەم شێوەیە هەموویان چوونە گۆڕەپانەکەوە.

پادشا بە تووڕەییەوە گووتی:

ئەوە چییە بە سواری وڵاخ هاتوون؟!

گەنجەکانیش گووتیان:

جەنابی خاوەن شکۆ، کوا ئێمە سواری وڵاخ بووین ئەوە نییە سەیری قاچمان بکە، چۆن لەسەر زەویە، بەپێی خۆمان دەڕۆین.

پاشان پادشا دەڵێت:

کەواتە بە پێ هاتوون.

ئەوانیش دەڵێن:

جەنابی خاوەن شکۆ، سەیرمان کە، ئەوەتا ئێمە سواری وڵاخ بووین.

پادشا بەم سینەمایە زۆر پێدەکەنێت و دەڵێت:

برۆن بەیانی وەرنەوە، هەرکەسێک بەیانی بە پێکەنیەوە بێت دەیکوژم، هەرکەسێکیش بە گریانەوە بێت، هەر دەیکوژم.

هەر بەهەمان ئامۆژگاری باوکی تاسی، گەنجەکان هاتنەوە. دەموچاویان بە ئاوی پیاز سواخ دابوو. بەو شێوەیەی کە هەمووکاتێک فرمێسک لە چاویان دەهاتە خوارەوەو بەڵام لەهەمانکاتیشدا دڵخۆشبوون و قاقا پێکەنینیان لێدەدا، بەوەی کە ئەمجارەشیان پەنێکی تر بە پادشا دەدەنەوە.

بەو شێوەیە کە پادشا ئەم بەزمەی گەنجانی بینی، دەستیکرد بە پێکەنینێکی زۆرو هەموو مۆنی و گرژییەکانی سەر دەموچاوی نەما. پاش ماوەیەک هاتەوە سەرخۆیی و هێمن بوویەوەو بیریکردەوەو پێی گووتن:

ئەمە تەنها عاقڵی و ژیری پیاوێکی پیرە، کە ئامۆژگاری ئێوە دەکات و توانی ئێوە لە مردن رزگار بکات . دڵنیابن کە هیچتان لێ ناکەم، تەنها ئەوە نەبێت. پێم بڵێن ئایا کەستان پیرێکی شاردۆتەوە، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریتان بکات، دەنا ئەم وەڵامانە لە کەسێکەوە نایەت، کە ژیانێکی زۆری نەدیبێت، تا ببێتە خاوەن ژیریەکی ئاوها، دەنا ئێوەی دەبەنگ ئاوەزی ئەوەتان نییە و هێندەش عاقڵ نین.

هەموو گەنجەکان بێدەنگ بوون و کەسیان نووتقیان نەدەکرد، بەهەمان شێوەش تاسی بێدەنگ بوو.

پادشا گووتی:

ئەگەر راستیم پێ بڵێن، سوێندبێت بە گۆڕی باو باپیرانم، ئەگەر یەکێکتان باوکی خۆی شاردبێتەوە، دەتوانێت پێم بڵێت بە بێ ترس و ژیانی ئەو پیرەش بەسەلامەتی دابین دەکەم و نایکوژم. لەوە باشتریش، مژدەتان دەدەمێ، باوکی هەرکەسێکتان هەیە، دەیکەمە وەزیری دەستە راسی خۆم.

ئەوە من ئێستا تێگەیشتم، ئەو پادشایەی ریش سپی لەتەک نەبێت، وەکو هێزێکی کوێروایە، کە خۆی بە چەپ و راستدا دەدات و بە دڵنیاییەوە پێتان دەڵێم: کە بەرەو هەڵدێران و فەوتاندن دەڕوات. سەفەرکردن لە شەوێکی تاریکدا، بەبێ تەنگوچەڵەمە و ترسناکی نییە. وڵاتێک کە پیری ژیری تێدا نەبێت، وەکو سەفەرێک وایە لە شەودا بە بێ مانگ.

هەربۆیە ئەو کەسەی کە باوکی خۆی شاردۆتەوە، بەبێ ترس و لەرز بابێت و پێم بلێت کێیە، من خەلاتی دەکەم.

کە تاسی لەقسەکانی پادشا دلنیا بوو، ئینجا هاتە پێشەوەو گووتی:

قسە بە حیکمەتەکانت دلی ئێمەی فێنک کردەوە، من بووم باوکمم شاردەوە، هەر ئەویش بوو کە هەموو وەلامەکانی پێ دەداین.

هەموو خەلکەکە بەهەڤرا چـوون بۆ ئەشکەوتەکەو باوکی تاسی بە سەرکەوتووانە دەهێننەوە بۆ گوندەکە. پادشاکەش دانی بەهەلەی خۆیدا ناو، پیاوە پیرەکەی کرد بە وەزیری دەستە راستی خۆی و هەتا مردن لەپەنا خۆیدا داینا.

ئیتر لەوکاتەوە هەموو پادشاکانی ئەفریقا، بێ پرس و رای ریش سپییەکانیان، حکومی ولاتیان نەدەکرد.

منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

هەتا حکایەتێکی تری بەرئاگردانی ئەفریقی، بە خواتان دەسپێرم.

فەرەنسا - شاری لیل

**چەند دێڕێک لەبارەی نووسەرەوە:**



Amadou Hampate ba ئەمەدو هامپاتێ با، لە خێزانێکی ئەرستۆکراتی پوێلی ولاتی مالی لە سالی ١٩٠٠ لەدایک بووە. ئەمەدو، نووسەر و مێژوونوس،

ئێتنۆلۆگ و شاعیر وحکایەتخوان بووە. ئەمەدو یەکێکە لە نووسەرە ناسراوەکانی ئەفەریقاو ماوەیەکی زۆریش، وەکو راوێژکار لە رێکخراوی یونیسکۆ کاری کردووە. ئەمەدو، شارەزاییەکی ئێجگار باشی لە فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی ئەفریقادا هەبووە. بەتایبەت فۆلکلۆری ناوچەی ساحیلی ئەفریقا. ئەمەدو دەڵێت: لەگەڵ مردنی هەر پیرێکی ئەفریقی، کتێبخانەیەکی گەورەی ئەفریقا دەسووتێت. لێرەدا نووسەر مەبەستی ئەوەیە، کە کولتووری ئەفریقی زۆر دەوڵەمەندە، بەڵام بەداخەوە نەنووسراوەتەوەو هەر ئەدەبێکی زارەکییە. لەپاش مردنی هەر پیرێکیش، کۆمەڵێک حکایەت و پەندو حیکمەتی گەورە لەناودەچێت. ئەمەدو کۆمەڵێک کتێبی بە زمانی فەرەنسی نووسیوە. ئەم حکایەتەش لەیەکێک لە کتێبە بەناوبانگەکانی ئەم نووسەرە وەرمگێڕاوە بەناوی: "شەڕی بچووک نییە". لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩١، لەتەمەنی نەوت ساڵیدا لە ئەبدیجان کۆچی دوایی کردووە.

**سەرچاوە:**

Amadou Hampate Ba- Il n y a pas de petite querelle . Pocket . Edition . Siant -Amand - Montrond. France. 2006

# مەرگی خاتوو فیرکان



**نووسینی: مارکیز دی ساد**
**و. لە عەرەبییەوە: یاسین عومەر**

...کەمتر لە پازدە رۆژ پێش ئێستا نامەیەکم لە خاتوو فیرکانەوە پێگەیشت، کە تیایدا لێم دەپاڕێتەوە تا سەری لێبدەم. لە نامەکەدا پێم دەڵێت کە بە سەرلەنوێ بینینەوەم زۆر خۆشحاڵ دەبێت، بۆیە منیش چووم بۆ لای، بەڵام لە چ حاڵێکدا بینیمەوە خوایە گیان! چ تاڵاوێکم لەگەڵیا چەشت خوای گەورە!

کە گەیشتمە لای ئەو، لەسەر پێخەفی مردن بوو، بەڵام من ئەمەم لەکوێ بزانییایە خودایە! تەنها بەر لە دوو هەفتە نامەیەکی بۆ نووسیبووم... تەنها دوو هەفتە پێش ئێستا، لەو نامەیەیاندا باسی چێژە هەنووکەیی و شادییە ئاییندەییەکانی خۆی بۆ کرد بووم... کەواتە ئەمەیە هەقیقەتی پڕۆژەکانی مرۆڤە ناسەرمەدییەکان. هەر ئەوەندەی خەریکن لە دروستکردنی کۆشک و تەلارەکانی دەبنەوە بێباک بەرامبەر ئەم چرکەساتە قەدەرییە چێژی بەرهەمەکانیان بچننەوە، وا هەڵسوکەوت دەکەن وەک ئەوەی کە نەمر بن لە ژیاندا، هەر ئەوەندەی خەریکن

دەگەنە ئەمە مەرگی دڵڕەق دێت و پەتی بوون و ژیانیان دەپچڕێنێت و نادڵنیا بەرامبەر بەو چارەنووسەی چاوەڕێیان دەکات لە هەوری نەمرییەکی نارۆشندا بزر دەبن و نامێنن.

ئەو کات خاتوو فیرکان لاو نەبوو. گەورە بوو بوو و بووبووە خانمێکی پەنجا و دوو ساڵ، کەچی لەو پیاسەیە درێغی نەکردبوو کە بۆ ئافرەتێکی وەکی تەمەنی ئەو ئەوپەڕی شێتییە. راستەوخۆ پاش پیاسەکە خۆی هەڵدابووە ناو ئاوەوە تا ساردببێتەوە، هەستی بە ئازارێکی توند کردبوو، لە کاتێکدا کە حاڵی زۆر شڕ بوو مایەی بەزەیی بوو، گواستیانەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. رۆژی دواتر لویەک لەسەر سنگی دەرکەوت، لە رۆژی شەشەمدا پزیشکەکە پێی وت کە تەنها بیستوچوار کاتژمێری لەبەردەمدا ماوە. ئەو لەبەردەم ئەم هەواڵەدا هیچ ترس و تۆقینێکی لێ دیاری نەدا.

هەروەک پزیشکەکە دەیوت، دەیزانی من هەر ئەو شەوە کە تێیدا دەمرد دەگەمە لای. پزیشکەکەی راسپاردبوو کە پێشوازیم لێ بکات.

کاتێک گەیشتم لە ژوورێکدا بینیم لەوپەڕی شیکی و جوانیدا بوو. لەسەر سیسەمێک راکشا بوو کە هەر ئەوەندەی تەماشاوان سەیری دەکرد یەکسەر زەوقی هەڵدەستاو دەورووژا، تاجەگوڵینەی سرووشتی بەشێوەیەکی سەیر بازنە پەردە لەیلەکییە گەورە رازێنراوەی بەرز دەکردەوە، چەپکە مێخەک و گوڵە یاسەمین و دورنیات هەموو لایەکی ماڵەکەیان رازاندبووەوە، کە بە ئەنقەست لە حەوزی گوڵەکاندا داماڵی بوو، ژوورەکـەی پێ تەنی بوو و پێخەفەکەی پێ داپۆشیبوو. هەر ئەوەندەی بینیمی دەستی بۆ درێژ کردم و وتی:

-فلۆرفیل نزیک بەرەوە و ماچم بکە، لەکاتێکدا من لەسەر پێخەفە گوڵگوڵییەکەمم... چەند گەورە و جوان بوویت...، ئاە خوایە گیان! چەند... کچم... پێیان وتوویت کە من دەمرم... منیش ئەمە دەزانم... بەڵێ، پاش چەند کاتژمێرێکی کەم دەمرم، باوەڕم نەدەکرد کە تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت بتبینمەوە...

بینی فرمێسکێک لە چاوما دەبریسکێتەوە، بۆیە پێی وتم:

– بەسە گەوجە. وەک منداڵ رەفتار مەکە... پێتوایە من زۆر بەدبەخت و کلۆڵم؟ بۆ من وەک هەموو ژنانی دیکەی جیهان چێژ و خۆشیم وەرنەدەگرت؟ من جگە لەو ساڵانەی کە بێ ئەوەی چێژ و خۆشییان تیا

وەربگرم و تێپەڕین، هیچی دیکەم لەدەست نەچووە، کە لەبری ئەوە چیم دەست کەوتووە؟ لە راستیدا من بەهیچ جۆرێک حەسرەت بۆ ئەوە ناخۆم کە تەمەن نەیگەیاندمە پیری. ئەگەر چەند ساڵێکی دیکە بمامایەتەوە ئەوا دەبوومە وشکەهەڵاتوویەک کە زەوقی هیچ پیاوێکم هەڵنەدەساند و دەبوومە مایەی بیزلێهاتنەوە و سەرشۆڕی، ئەمەش ئەو شتە بووە کە هەموو رۆژێک لە رۆژەکانی ژیانم پێداگر بووم لەسەر ئەوەی تووشی نەبم. کچی خۆم تەنها ئەوانە لە مردن دەترسن کە باوەڕیان بە دۆزەخ و بەهەشت هەیە و نازانن دەرگای کامیانیان بۆ دەکرێتەوە. نیگەرانی ئەمە وێرانیان دەکات، بەڵام من کە هیوا بۆ هیچ ناخوازم، بەڵام من کە تەواو دڵنیام دوای مردن بەدبەختتر نابم لەوەی کە لە ژیانمدا بووم، لە ئامێزی سرووشتدا بە دڵنیاییەوە دەنووم، بێ داخ و ئازار و نیگەرانی، داوام لێکردوون کە بمخەنە لانکە یاسەمینییەکەم، ئەوەتا دەستیان کردووە بە ئامادەکردنی شوێنەکەم لە ناویدا. فلۆرفیل پاش تۆزێکی تر لە ناویدا دەبم، ئەو گەردیلانەی کە لەم جەستە تێکشکاوەمەوە بەرز دەبنەوە دەبنە خۆراکێ بۆ هەموو ئەوانەی کە زیاترم خۆشویستوون دەڕوێن و گوڵ، لەکاتێکدا بە چەپکێک لەو گوڵە یاری بە رووومەتم دەکرد درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:

– ...ساڵی داهاتوو کاتێک بۆنی ئەم گوڵانە دەکەیت رۆحی هاوڕێ دێرینەکەت هەڵدەمژی کە من دەبمە ئەو. بیرۆکەی جوان جوان بەسەر خانەکانی مێشکدا گوزەر دەکات و ناچارت دەکات کە زیاتر بیرم لێ بکەیتەوە.

فرمێسکەکانم جۆگەیەکی تازەیان لەسەر رووومەتم بەست... دەستەکانی ئەو ئافرەتە بەدبەختەم گوشی، ویستم ئەو بیروڕا ترسناکانەی بە راوبۆچوونێک بگۆڕم کە کەمتر کفر بن، بەڵام هێشتا ئەو ئارەزووەی خۆم دەرنەبڕیبوو خاتوو فیرکان بە ترسەوە لەخۆی دوور خستمەوە و هاواری کرد:

– ئاخ فلۆرفیل، تکایە دوایین ساتەکانم بە هەڵەکانت لێڵ مەکە. لێگەڕێ بە ئاشتییانە بمرم، خۆ من بە درێژایی ژیانم بۆ ئەوە رقم لە بیرۆکەی لەم چەشنە نەبووە تا لە کاتی مردنمدا تەبەنی بکەم.

ئەو قسانەی دەمکوتیان کرد، رەوانبێژییە لاوازەکەم لەبەرامبەر سوووربوونە جدییەکەی ئەودا دەیتوانی چی بکات.

بەبێ ئەوەی بتوانم لە بیروباوەڕەکانی پەشیمانی بکەمەوە، خاتوو فیرکانم نائومێد کرد. بانگێکی لێوە هات یەکسەر دەنگی مۆسیقایەکی هێمنی خەمناکم هاتە گوێ. دەنگەکانی دەتوت لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دێن.

ئەو ژنە ئەپیکۆریە[1] وتی:

فلۆرفیل ئاوا دەمەوێت بمرم، ئایا مردن بەم چەشنە باشتر نییە وەک لەوەی کە بە راهیبگەلێک دەورم بتەنرێت کە دوایین ساتەکانم بە پەشێوی و وریاکردنەوە و بێئومێدکردن لێڵ بکەن... نەخێر، من دەمەوێت راهیبەکانت بزانن کە مرۆڤ پێویستی بەوە نییە کە لەوان بچێت تا بە ئاشتی بمرێت، دەمەوێت قنیات بکەن کە مرۆڤ پێویستی بە ئایین نییە تا بە ئاشتی بمرێت، بەڵکو پێویستی بە بڕێک ئاوەز و ئازایەتی هەیە.

-کات بۆ پێشەوە ملی دەنا، نووسەرەوەی گرێبەستەکان هاتەژوورێ، ئەو داوای کردبوو بیهێنن. چەند راسپاردەیەکی نووسی: بێوەژنەی چەندین ساڵە بێوەژن، بێ منداڵ، هەندێ دیاری بۆ کەسوکار و هاوڕێکانی راسپارد. پاش ئەمە سندووقێکی بچووکی لە کۆمەدییەکی بچووکی تەنیشتی سیسەمەکەی دەرهێنا و وتی:

– ئێستاش، ئەمە هەموو ئەو شتانەیە کە ماومە، با ئەودوای شەوەکە بە خۆشی و شادی بەسەر بەرین.

ئەوەتا ئێوە حەوت کەسن لە ژوورەکەمدا... ئەم پارە و زێڕانە دابەش دەکەم بۆ شەش بەش، تیر و پشک لەنێوانتاندا دەکەن، هەر یەکەتان ئەو بەشە دەبات کە بەختی دەیهێنێت.

بۆ چرکەساتێکیش لە بیرکردنەوە لە خوێنساردیی ئەو ژنە نەدەوەستام. زۆر لام سەیر بوو کە مرۆڤ هێندە گوناهە و تاوانی زۆری کرد بێت کە خۆ سەرزەنشتکردن بسەپێنێت، کەچی بەم هێمنییە کوشندەیەی کە بەرئەنجامی کفر و نکوڵیکردنە بگاتە دوایین ساتەکانی ژیانی. گەر مەرگی هەندێ کەسی بەد و خراپ مرۆڤ بلەرزێنن، ئەی چۆن مرۆڤ ناتوانێت هەست بە لەرزینێکی گەورەتر بکات لە بەردەم ئەم سەختییە خۆڕاگرە مکوڕە!

لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ئەو شتانەی بۆ دێت کە ئارەزووی کردوون. ژەمە خواردنێکی سوک و بەلەزەتی خوارد، پاشان مەیی ئیسپانیی و

شلەمەنیگەلێکی دیکەی خواردەوە، بەتایبەتی کە پزیشک پێی وتبوو بە بەراورد بەو بارە تەندروستییەی تێیدایەتی نە سوود نە زیانیان نییە.

تیروپشکەکەی راکێشا، هەر یەکەمان دەوروبەری سەد لویزیی زێڕ یان زیوی بردەوە. خەریک بوو ئەو یارییە بچووکە کۆتایی دەهات کە ئازارێکی گەورە خاتوو فیرکانی داگرت. بەوپەڕی هێمنییەوە لە پزیشکەکەی پرسی:

- ئایا ئەم ساتە دەمرم؟

- دەترسم وابێت، خانمەکەم.

لەکاتێکدا دەستی بەرەو رووم درێژ دەکرد بانگی کردم:

وەرە فلۆرفیل تا دواماڵئاواییت لێ بکەم، چونکە دەمەوێت لە ئامێزی چاکەدا دوایین هەناسەم بدەم.

- دەستی کردە ملم و بە توندی باوەشی پیا کردم و پاشان بۆ هەتاهەتایە چاوانی لێک نا.

**سەرچاوە:**

موت السیدە فیرکان، قصە: المارکیز دُ ساد.

# كورد هه‌ر باهۆزی هه‌یه



**شیعری مه‌حموود ده‌رویش**

**پێشه‌كی و وه‌رگێڕانی: ئه‌نوه‌ر قادر محه‌مه‌د**

**پێشه‌كی:**

كاتی خۆی، له‌ حه‌فتاكاندا، ئێمه‌ تازه‌ چووبووینه‌ زانكۆی به‌غدا و دنیای نووسین، سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌كیی خوێندنه‌وه‌مان بێجگه‌ له‌ زمانی كوردی، به‌عه‌ره‌بی بوو. شیعری فه‌له‌ستینی به‌گشتی و شیعره‌كانی مه‌حموود ده‌رویشمان به‌ سۆزێكی تایبه‌ته‌وه‌ ده‌خوێنده‌وه‌. ئه‌گه‌ر ره‌خنه‌گرێكی ورد مه‌به‌ستی بێ، كاریگه‌ریی شیعره‌كانی ئه‌و له‌سه‌ر ئه‌و شاعیره‌ كوردانه‌ی كه‌ رێبازی شیعری یان سیاسه‌تاندنییه‌تی، به‌بێ ماندووبوون و ئه‌ركێكی وه‌ها ده‌دۆزێته‌وه‌. زیاده‌ڕۆیی نییه‌ ئه‌گه‌ر بڵێم شیعره‌كانی مه‌حموود ده‌رویش بۆ ئه‌وانه‌ وه‌ك فریادڕه‌سی نێو گێژاوی وشكبوونه‌وه‌ی دوای به‌ناكامی له‌دایكبوون وابوون...

كه‌س لاریی له‌ سوودوه‌رگرتن له‌كولتوور و به‌رهه‌می خۆماڵی و جیهانی نییه‌... به‌ڵام گرنگ ئه‌وه‌یه‌ چۆن سوودی لێوه‌رده‌گری... به‌ڕۆژی ڕوون چه‌پاوی ده‌كه‌ی و به‌ناوی خۆته‌وه‌ بڵاوی ده‌كه‌یته‌وه‌، یان مامه‌ڵه‌یه‌كی هونه‌رمه‌ندانه‌ی له‌گه‌ڵدا ده‌كه‌ی؟! به‌هه‌رحاڵ! ئه‌مه‌ ئه‌ركی ئه‌و تۆژه‌ر و ره‌خنه‌گرانه‌ن كه‌ به‌ پاشخانێكی كولتووریی به‌پێز و ده‌وڵه‌مه‌نده‌وه‌ بێ له‌ڕوودامان و پرینگانه‌وه‌ دێنه‌ مه‌یدان و به‌رهه‌می ئه‌وانه‌ شی و یه‌كالا ده‌كه‌نه‌وه‌...

هه‌ر له‌و سه‌رده‌مه‌دا، چه‌ند شیعرێكی هۆنراوه‌ی "كوردستان"ه‌كه‌ی ده‌رویش، له‌ كتێبێكدا كه‌ ده‌رباره‌ی شیعری فه‌له‌ستینی بوو، بڵاوكرابوونه‌وه‌. دانه‌ری كتێب ڕه‌گه‌زپه‌رستێكی به‌رپێی خوێنه‌بین بوو، ده‌رویشی به‌وه‌ تاوانبار كردبوو كه‌ ده‌یه‌وێ "ئیسرائیلی دووه‌م" له‌سه‌ر خاكی عه‌ره‌ب دابمه‌زرێنێ و له‌م قسه‌

پڕوپووچ و بێسەروبەرانە...

کچێکی ڕۆشنبیر و سەربەست لە پۆلەکەماندا هەبوو لەگەڵ کچێکی فەلەستینیدا لە بەشی ناوخۆیی لە ژوورێکدا دەژیان، کە خەڵکی "ضفة" بوو... کچەکە ڕۆژێک بە ڕوویەکی گەشەوە هات بەرەو پیرم و وتی: ئەم دیوانەی مەحموود دەرویشم بۆ هێناوی. وتم: سوپاس خۆم هەمە. وتی: بیکەرەوە، کە کردمەوە هەموو شیعرەکەی "کوردستان"ی تێدابوو. هەر ئەوە نەبوو لە شادیدا باڵ بگرمەوە... ئەنوەر (فەرهاد) شاکەلی لەولامەوە وەستابوو، پڕی کرد بە دیوانە شیعرەکەدا و فڕاندی... شاگەشکە بووبووین. دواتر لە شەڕە دەنووکێکی ڕۆژنامەی "التآخي" و "الثورة"دا لەسەر مافەکانی گەلی کوردستان، کاکە حەمەی مەلا کەریم فرسەتی هێنا و بە پێشەکییەکی کورتەوە شیعرەکەی لە "التآخي"دا دابەزاند. دەنگێکی گەورەی دایەوە...

ڕاستییەکەی بۆ ئەو عەقڵییەتەی کەلای دەستەڵاتداران و گەلێ لە ڕۆشنبیرانی عەرەبی ئەوسا و ئێستاش زاڵبوو و زاڵە، ئەم هەڵوێستەی دەرویش بە ناپاکی بەرانبەر بە نەتەوەی عەرەب لە قەڵەمدەدرا!

شاعیری کۆچکردوو کاک جەلالی میرزا کەریم تەرجەمەیەکی جوانی شیعرەکەی کرد و وابزانم خەڵکی تریش کردوویانە بە کوردی. دواتر لە بەیرووت دیوانی "سەرجەم شیعرەکانی دەرویش" دەرچوو، نەک هەر ئەم شیعرەی تێدا نەبوو، بەڵکو لەپشتی کتێبەکەش هەندێ سەرنجی نووسیبوو، گوایە هەندێ لەو شیعرانەی کە بەهەڵەشەیی هەرزەکارانە و کاڵ و کرچی نووسیونی لەم چاپەدا بڵاوی نەکردوونەتەوە... ئەمە ئێمەی نائومێد و تووڕە کردبوو... "تاقە ئەدیبێ هەڵکەوت، ئەویش پەشیمانبوویەوە". ڕۆژگار هات و چوو... دواتر شاعیر لە شیعرێکی تریدا ئاماژەیەک بە کورد دەدا و بەخۆشەویستییەوە بۆی دەنووسێ: "ولي نيروز بضفائر كردية فيا لشمالا لشجن.." لە گفتوگۆیەکیشدا خۆی باسی ئەوەی کردووە، کە شیعرێکی هەیە بەناوی: "وأرميهم بالسجيل" و بۆ وڵاتپارێزانی باکووری کوردستانی وتووە... هەروەها ئەم شیعرەشی کەمن لێرەدا کردوومە بە کوردی و بە هاوڕێی نزیکی، بە شاعیر و نووسەری ناودار سەلیم بەرەکاتی پێشکەشکردووە... وەک بیرمەندی کۆچکردووی ناسراوی عەرەب و دۆستی کورد –هادی عەلەوی– دەڵێ: "کورد لە بەرانبەر جامێ ئاودا، بە دەریایەک وەفا وەڵامتدەداتەوە"... ئێمەی ئێستا سەرجەم موو ماش و برنجبوو، هەر بەیادی ئەو ڕۆژە گەشانەی جارانەوە، وەک غەریبییەکی ئەو ڕۆژگارە و یادێک لەو شاعیرە گەورە بە ناوەخت کۆچکردووە، کە جێ پەنجەی خۆی بەسەر شیعری

کوردییەوە بەجێهێشتووە. بەڵێ! وەک یادێک لە مەحموود دەرویشی شاعیر، لەو پیاوەی کە بەڕاستی خەڵکی تریش و وڵاتە غەریبەکەی خۆی تاڕادەی پەرستن خۆشدەویست، ئەم شیعرەیمان کرد بە کوردی و بڵاوی دەکەینەوە.
شیعری مەحموود دەرویش

## کورد هەر باهۆزی هەیە

**بۆ سەلیم بەرەکات**

**کاتێ سەر لە کوردەکە دەدەم،**
**سبەینێی خۆی بیردەکەوێتەوە...**
**بە گسکی تۆزماڵینەکەی دووری دەخاتەوە: وازم لێبێنە!**
**چیا هەر چیایە. ڤۆدکا دەنۆشێ**
**بۆئەوەی خەیاڵ بەبێ لایەنی بمێنێتەوە: من**
**ڕێبواری خوازەی خۆمم، قوڵنگە چەقاوەسووەکان،**
**برا لاژگەکانمن و سێبەر لە ناسنامەکەی دەتەکێنێ:**
**زمانەکەم ناسنامەمە، من و من زمانەکەمم.**
**من ئاوارەی نێو زمانەکەمم.**
**دڵم پشکۆی کوردە بەسەر چیا شینەکانییەوە...**
**نیقۆسیا -وەک هەموو شارەکانی تر-**
**پەراوێزانی هۆنراوەینی...**
**بەپاسکیلێک هەموو لاکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و وتی:**
**لەدوا شوێن دەگیرسێمەوە.**
**ئاوا بۆشایی هەڵبژارد و نووست. لەوساتەوەی**
**جنووکە چوونەتە نێو وشەکانی، خەوی بەهیچ شتێکەوە نەبینیوە.**
**(وشەکانی ماسوولکەکانین. ماسوولکەکانی وشەکانین)**
**خەوبینەکان دوێنێ پیرۆز دەکەن، یان**
**ئاوڕشێنی دەرگای ئاڵتوونیی سبەینێ دەکەن...**
**نە سبەینێم هەیە و نەدوێنێ،**
**ئێستا مەیدانە سپییەکەمە.**
**ماڵەکەی وەک چاوی کەڵەشێر پاکە،**

لەبیرکراوە وەک دەواری سەرۆکی ئەو هۆزەی
وەک پەڕ پەرت و بڵاوبوونەوە.
فەرشێکی خوریی لوولدراو
فەرهەنگێکی پەڕپووت بوو.
کتێبانی بەپەلە بەرگتێگیراو،
سەرینانێک بە دەرزیی شاگردی چایخانەکە چنراو.
چەقۆی بۆ سەربڕینی باڵندە و بەراز لە هەساندراو...
ڤیدیۆی فیلمە رووتەکان،
چەپکە دڕکێکی هاوتای رەوانبێژی.
باڵکونێکی لەڕووی میتافۆردا کراوە.
ئالێرەدا تورک و یۆنانییەکان بەنۆرە جنێو بەیەک دەدەن.
ئەمە سەرگەرمی و گاڵتەی من و هی ئەو سەربازانە بوون،
لەسەر سنووری گاڵتەجاڕییەکی رەش...
ئەم رێبوارە هەرچۆن رێکەوت سەفەر ناکا...
باکوور باشوورە، رۆژهەڵات رۆژئاوایەکی
نێو تراویلکەیە. (با) هیچ جانتای نییە، تۆزیش هیچ ئەرکێ.
وەک ئەوەی سۆزی بۆ کەسانی تر بشارێتەوە،
گۆرانی ناڵێ... کاتی درەختی ئاکاسیا دەچێتە سێبەرەکەیەوە،
یان نەرمەبارانێ قژی تەڕ دەکا...
بەڵکو بانگی گورگ دەکا، داوای زۆرانی لێ دەکا:
وەرە کوڕی سەگ، با لە تەپڵی ئەم شەوە بدەین،
تا مردووەکان هەڵسێنین.
کوردەکان لە ئاگری ڕاستی نزیک دەبنەوە و
وەک پەروانەی شاعیران دەسووتێن،
دەزانێ چی لە مانا دەوێ، هەمووی
بێهودەییە. وشەکانیش بەخۆڕایی خەریکی فێڵی راوکردنی دژەکانیانن
کچێنیی وشەکان دەبات و
بە لاقەنەکراوی دەیانگێڕێتەوە بۆ فەرهەنگەکەی.
ئەسپی ئەلف و بێ وەک بەرخ بۆ ناو کەمینی دەهۆی خۆی بەکێش دەکا،
تووکی بەریزمان دەتاشێ: تۆڵەم لە (غیاب) کردەوە،
ئەوەم کرد کە تەمبە براکانمی کرد.

دڵم وەک نێچیرێک برژاند.
وەک ئەوەی دەمەوێ وا نابم.
خاکیشم لەهۆنراوەیەک زیاتر یان کەمتر خۆشناوێ...
کورد هەر باهۆزی هەیە
نیشتە و ئالوودەییەک دیدەبن.
بۆئەوەی لە سیفەتی خاک و شتەکان ئازادبێ...
قسەی لەگەڵ مەجهوول دەکرد: ئەی کوڕی ئازادم،
ئەی بەرانی وێڵیی هەتاهەتایی. ئەگەر باوکت
دی هەڵواسرابوو، لە پەتی ئاسمان دایمەگرە خوارەوە،
بەلۆکەی سروودی شوانانەت کفنی بۆمەکە، مەینێژە کوڕم،
باهۆز وەسییەتی کوردە بۆ کورد لە تاراوگەیدا.
کوڕی خۆم... هەڵۆی زۆرم لە دەورن،
بەدەوری تۆشدا، لەو ئەنادۆڵە بەرفراوانەدا،
تەرمەکەم نهێنی و رەمزییە
بێوەرییەتی بگەڕێنەرەوە چارەنووسی خۆی و
ئاسمانی یەکەمت بەکێشکەرەوە ناو فەرهەنگە سیحراوییەکەت.
ئاگات لە جێ چزووی ئومێدی زامداربێ،
ئەمە دڕندەیەکی (سامناکی) ئەفسانەییە و تۆ ئێستا
تۆ ئێستا ئازادی، تۆئەی کوڕی خۆت،
تۆ ئازادی لە باوکت و نەفرەتی ناوەکان...
بە زمان تۆ بەسەر ناسنامەدا سەرکەوتی،
بە کوردەکەم وت: بە زمان تۆڵەت
لە (غیاب) کردەوە...
وتی: ناڕۆم بۆ سەحرا
وتم: هەروا منیش و
سەیری (با)م کرد
ئێوارەت باش
ئێوارەت باش

هەشت کورتەشیعری

# غوڵام حوسەین نەسیری پوور

و. لە فارسییەوە: یونس حسەینی

-١-

هەسارەیەک بێقەرارە
لە کوڵانە تەنگەکانی هەورا
لە واوەیلای زامی زەوی
شەمچەیەک هەڵکە
تا چاوتم بیر نەچۆتەوە.

-٢-

لە پێڵوی بێدەنگی تۆ تێدەپەڕن
هەموو رێگاکانی دونیا
تا وشەیەک لەسەر لێوی ئاو بڕوێ
پردی لە رەنگی روانینت
بدوورە سەرلێوی شەپۆل.



-٣-

دڵەڕاوکێ
کەڵەشێرە پیرەیە
بە گەرووی پڕ هەسارەوە
لە سەربانی تاریکی نیوەڕۆ
ئەگری.

-٤-

تا پەنجەرەم دووری
دەریاەک لە شنە و بەهار
رژانە نێو ژوورەکەم.
بە گوڵدانی پەنجەرەچنەوە
ئیتر تەنیا نیم.



-٥-

دەستم ئاوێتەی خوێنی هاواری تۆ نییە
ئەم زەردە چەقبەستووە
عەتری چاوی هەورێکە
بەسەر تاقەتی روانینما دائەبارێ.

-٦-

دڵۆپم
بەڵام
نازانم بۆ و چلۆن بەر لەتۆ داباریوم.

-٧-

ئاخۆ کێ وشەی ئاوی
لەسەر لێوی ماسییەکانی کانی هەڵگرتووە؟
وا عەتری هیچ دڵۆپە بارانێ
لە دڵما گۆرانی نالێ.

-٨-

تا( با) لە دەنگی تۆ ئاوس ببێ
عەترێ لە روانینت
بەسەر گرسانی
سەوزە و هەورا
داببارە.

هەست و میهرەبانی مانگ

# شارڵ بودلێر
# Charles Baudelaire
# (١٨٦٧-١٨٢١)



**و. لە فارسییەوە: هادی محەمەدی**

مانگ کە زۆر دڵ تەڕە، کاتێ لە بێشکەدا خەوتبووی، لە پەنجەرەوە سەیری کردی، بە خۆی وت: "چ منداڵێکی خوێن شیرین!"

بە نەرمی بە پلەی هەورەکاندا هاتە خوار و بەئەسپایی لە شیشەوە هاتە ژوور و ئەوجار وەک دایکێکی نەرم و دڵسۆز باوشی پیاکردی و تریفەی رەنگەکانی لە روخسارت هاویشت، لەو کاتەوە پێڵوەکانت سەوزن و گۆناکانت زۆر بێ رەنگن.

بە دیتنی ئەم میوانە چاوەکانت ئێجگار گەورە بووگن؛ هێندە بە حەزەوە گەرووتی گووشیوە، کە تا ماوی تەمەنای گریانت هەیە.

بەمەیشەوە مانگ بە شۆڵەی شادی بەخشی، وەک جۆباری زیوین، هەموو ژوورەکەی وەک ژەهرێکی پرشنگدار پڕ دەکرد و؛ بە هەموو تیشک و وزەیەوە دەیوت: "کاریگەری ئەم ماچەم هەمیشە لە تۆدا دەمێنێ. وەک من جوان دەبی.

ئەوەی من خۆشم بوێ، خۆشت دەوێ و ئەوەی منی خۆش بوێ، خۆشت دەوێ: ئاو و هەور و شەو و بێدەنگی؛ دەریای سەوز و بێ سنوور؛ شینی بێ رومەت و هەزار رومەت؛ شوێنێک کە لەوێ نیت؛ دلدارێک کە نایناسیت؛ گوڵی هەرە مەزن؛ عەتری سیحراوی؛ ئەو پشیلانە کە لەسەر پیانۆ بێ هۆش دەبن و وەکوو ژنان بە دەنگێکی نزم و نەرم دەناڵێنن!

"دەبی بە خۆشەویستی دڵدارەکانم، دۆست و هەڤاڵانم. دەبی بە شاژنی پیاوانێکی چاوسەوز کە لە ژوانێکی شەوانەدا گەرووی ئەوانیشم گووشیوە؛ پیاوانێک کە عاشقی دەریان، عاشقی دەریای بێ سنووری سەوز و پەرێشان، ئەڤینداری شینایی بێ رومەت و هەزار روومەت، ئەڤیندارانی شوێنی نەدیو، ژنی نەناسراو، گوڵی نامۆ، عەترێک کە هەست و هۆش دەرفێنێ و مرۆڤ شەیدا دەکا، ئاژەلانێکی وەحشی و پڕشەهوەت کە دیمەنی شێتی خۆیانن."

هەر بۆ ئەوەیە ئەی کیژی گرانی بەناز و لەعنەتی کە ئێستا لەبەر پێتا خەوتووم و لە هەموو جەستەتدا بۆ دیمەنی ئەم خودا ترسناکە دەگەڕێم، ئەم دایکەی چارەنووس، ئەم دایەنە ژەهرینەی هەموو مانگ گرتووان.



**سەرچاوە:**

http://sohrabmokhtari.blogspot.com/200902//blog-post.html



# حەوت پارچە شیعری
# مەیسەم ریاحی
## (شیعری هاوچەرخی ئێران)

و. لە فارسییەوە: بابەک سەحرانەوەرد

**وتەیەک:**

مەیسەم ریاحی ساڵی ١٩٨٤ لە باکووری ئێران لەدایک بووە. خاوەنی دوو کۆمەڵەشیعرییە بە ناوی: «مانگ، ئاڵقەی بێ قامک» و «ئەم چاوە دوور و درێژە»، هەروەها چەند ساڵێکیشە سەرنووسەری گۆڤاری ئەدەبی «پیادەڕۆ» یە.

شیعرەکانی ئەم شاعیرە کە بە شیعری زمانی ناسراون، تا ئێستا لە زۆربەی گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئێران بڵاوبوونەتەوە و رەخنە و لێکۆڵینەوەی زۆریان بۆ تەرخانکراوە و هۆنراوەکانی بە چەند زمانی وەک: عەرەبی، ئینگلیزی، سویدی، کوردی و فەرەنسی وەرگێڕدراون.

-١-

بەیانی
لە گیرفانی هەر رێبوارێکدا بێ
نیوێ پرسیار و نیوێ چاویلکە شکاوە
کە لەنێوان ئێمە و خۆرەتاو
لە باشووریترین دەنگێ کە نابیسترێ
دەوری زەوییەک
دەگێڕێت
کە هەموو رۆژێک
بە تەپۆڵکەیەکی (زەرد)دا

بە جانتایەکی پڕ لە پەپوولە
دێتە خوارەوە و
بە جانتایەکی پڕ لە مردن
دەگەڕێتەوە.

-٢-

دایکم
هەر کارێکی کرد
نەیتوانی
ژن ببێ
باڵتاوەکەی فرۆشت
منیش لە مەمکی شەودا
شیرم خوارد
لەنێو بیرەوەرییەکانی کەڵەکێوییەک

-٣-

ئا لەم هەموو دارە
بەسەر گۆڕەکەم هێندە دەترسم و
رووبارەکان
ئێستاکەیش هەودا دەبەستن و
پێڵاوەکانم
لە دەرەوەی ژوورەکەم
پڕ لە ژانن.

-٤-

گوڵان
ئاو
دەخۆنەوە
بەڵام
جامە ئاوەکەیان
لە چاوی ئێمە قەرز دەگرن.



-٥-

ئەو کاتە تۆ لێرە نیت
بەرامبەری تۆ دەوێستم و
سڵاو
لەبەرد دەکەم.

-٦-



بە جگەرەیەکی شاش و بێش و
زمانێکی ونبوو
ئێستاکەش
کچێ بە لاڵی دەخوێنێ و
لاڵیش لە دەستەکانی
هەڵدەستێ و
بەرامبەری سێبەرەکەی
بە چەپکێ گوڵی سوورەوە
کڵاوەکەی لەسەر هەوا هەڵدەگرێ.

-٧-

ئەمن لە ئاڵەمی ئاسمانی تۆدا
وەک باڵندەیەکی سەر لێ شێواوم
کە لەنێو دارەکان هەڵفڕینی
ئەزموون کردبێ.
کاتێ، وەها دڵۆڤان دەبم
چلۆن پشت بە رۆژێکی کورت
کە تامەزرۆیی دیتنی خۆرم هەیە
نەکەم.

**سەرچاوە:**

«مانگ، ئاڵقەی بێ قامک»، کۆمەڵەشیعر، مەیسەم ریاحی، دەزگای داستان سرا، تاران، ١٣٨٦

## هونەر



## ناسر فەیزوللا بەیگی:

# هونەر بە سنووردابوون وشک دەبێتەوە و دەکەوێتە دووپاتکردنەوەی رابردوو

سازدانی: سەعیدە سائیب

شاری سەقز یەکێکە لەو شارانەی کوردستان کە بەردەوام کاری هونەری تێداکراوە مامۆستایانی گەورەی هونەری لێدەرچووە و تا ئێستاکەش هونەرمەندەکانی لەم رێگەدا بەردەوامن. مامۆستا ناسر فەیزوڵابەیگی یەکێکە لەو هونەرمەندانەی شاری سەقز کە پتر لە ٣٠ ساڵە لە بواری هونەردا چالاکە. هونەرمەند ناسر فەیزوڵابەیگی لای مامۆستایان فەیزوڵاخان ناهید ([باپیری]و بنیاتنەری شێوەکاری رۆژهەڵات)، مستەفا شێرزاد و موحەمەد رۆستەمزادە فێری شێوەکاریی بووە. لە سەرەتاوە لە شێوازەکانی ناتورالیزم، ئەمپێرسیونیزم دەستپێکردووەو لە درێژەشدا دەستیداوەتە خوێندنەوە و ئەزموونکردنی شێواز و بۆچوونە هونەرییەکانی هونەرمەندەکانی جیهان و کەڵکی لێوەرگرتوون، بەڵام لە ئەنجامدا شێوازی تایبەت بەخۆی هەڵبژاردووە. بە گشتی شێوەیەکی چاوەڕوانکراوی نییە و پیشانگاکانی ئەو راستییەیان سەلماندووە، بۆ نموونە پیشانگای قەفەسەکان، ئاوێنەکان، سەرشەقام، سەرقەبران و پیشانگای بە یادی هەڵەبجە ساڵی ٢٠٠٢ کە لە دوایین رۆژی پیشانگاکەدا تابلۆکانی بە نارەزایەتی کۆمەڵکوژی هەڵەبجە سووتاند و بینەرانی رووبەڕووی کۆمەڵێک پرسیارو شۆککردووە. ئەم هونەرمەندە لە بواری پەروەردەو راهێناندا لە تەمەنی منداڵ و گەورە ساڵدا بە ئەزموونە و کارێگەریی زۆری لەسەر قوتابیانی داناوە. هەروەها

کە ئاماژەمان پێدا ناوبراو پتر لە ٣٠ ساڵە لە بواری هونەردا چالاکەو تائێستاش ٤٦ پێشانگای هاوبەش و تاکی پێشکەشکردووە. ئەم وتووێژەش کە لەگەڵیاندا کراوە لە سەر بابەتی هونەرو کۆمەڵگایە کە لەگەڵ بەشێک لە بۆچوونەکانی ئاشنامان دەکات.

**روانگەی ئێوە بۆ هونەر بە چ شێوەیەکە؟**

بە ئاوڕدانەوەیەک لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، دەبینین کاتێک هەست و بیری بەرانبەر بە ئاسمان، دار، ئاژەڵ، خوێن و خۆی کردو کەوتنە جوڵە هونەر لە دایک بووە. سەماکردن، شێوەکاری و پەیکەرتاشی دروستبوون لەو سەردەمەوە تائێستا، واتە لە دەورەی ئەشکەوتەکانەوە تا ئەمڕۆ هەر کات و شوێنێک کولتوور و بۆچوونی هونەری تایبەت بە خۆی هەبووە، مرۆڤ بەردەوام بە دوای ئەزموونکردنی تیشک، جووڵە، مانا و چەمکەوە و... بووە تا مانایەکی تازە بە ژیانی ببەخشێت، هونەری ئەمڕۆی منیش هەر وەک پێشتر ئاماژەم پێداوە دروستکردن و پێکەوەنووساندنی پازلی شۆناسی کۆییمانە. لەم دۆخەدا کە تێیدا دەژین گەورەترین کێشە ئەوەیە هەمووشتێکین، بەڵام خۆمان نین، هونەر دەبێت بۆ وریاکردنەوەی کۆمەڵگا لە بێفیکری و خەوی مێژوویی بەکاربهێنرێت و بۆ تیمارکردنی زامەکانی کۆمەڵگا کەڵکی لێوەربگیرێت.

**سەبارەت بە نوێخوازی لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا چ بۆچوونێکتان هەیە؟**

تازەگەری لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پێویستە و بێ نوێخوازی و داهێنان بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا ئەستەمە، بەتایبەت لە هونەردا داهێنان و تازەگەری بەشی سەرەکی هونەرن، بەڵام تازەگەری چ لە کوردستاندا بکرێت چ لە ئەورووپا ئەگەر سەرنج و بایەخی پێنەدرێت، هەر لە کۆرپەییدا دەمرێت، دەبێت ئاگات لێبێت تا گەورە بێت و بەرهەمی هەبێت. لە مەودای نێوان ئەم منداڵی و گەورەبوونەدا کۆمەڵێک فاکتەر هەیە کە لەو فۆرم گرتنەدا رۆڵ دەبینن، کۆمەڵێک لەم فاکتەرانە دەبنە هۆی گەشەسەندنی و بە لای ئەدیویشدا دەبنە هۆی سەقەتبوونی. (داهێنان بە بێرەخنەگر، میدیاو خەڵک ناتوانێت سەرکەوتووبێت، تەنانەت لە رووتی خۆیشی جێدەمێنێت). جا لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە، ئایا لە کوردستاندا ئەم فاکتەر و بوارانە هەیە بۆ هونەرمەندی ئێمە؟ سەدی سەد نا بۆ نموونە هێنری موور هونەرمەندی ئینگلیزی ئەگەر لە سەردەمی خۆیدا لە بۆکان بژیایە تەنیا بەشێک لە کوردستان دەیناسی تازە ئەگەر تا ئەوکاتەیش وازی

لە کارنەهێنایە جا هێنری مووری بۆکانی لە کوێ و هێنری مووری ئینگلیزی لە کوێ؟! تازەگەری لە رۆژهەلاتدا هەیەو کراوە بۆ وێنە مامۆستای هونەرمەند موحەمەدی رۆستەمزادە (نامۆ) لە بیرو بەرهەمەکانیدا تازەگەری دەژیا هەروەها هونەرمەند شۆڕشی ئاهی بەرهەمەکانی تازەگەری تێدا بوو، بەلام نەبوونی ئەو فەکتەرانە کە باسمان کرد، بوونە هۆی نەناسین و دەرنەکەوتن و گەشەنەکردنی بەرهەمەکانیان و هەر بەو جۆرە گوتم تازەگەریی لەو بارودۆخەدا بەرهەمنایەت.

**سیاسەت لەهونەرداو هونەر لە سیاسەتدا چۆن دەبینن راتان سەبارەت بە هونەری سیاسی چییە؟**

هونەر و سیاسەت لە هەموو ولاتێکدا بەردەوام ئامادەن پێوەندییەکی قوڵ و پتەویان بە یەکدییەوە هەیە. گەورەیەک دەڵێت:(هونەرو سیاسەت وەک دوو چەرخی عەرەبانەیەک وان کە بێ یەکێک لەوانە کۆمەڵگا پێش ناکەوێت). هونەر لە خۆیدا و لەپێوەندی لەگەڵ شۆناسیدا داهێنان و تازەگەرییە و سیاسەت و فەلسەفە و هەموو ئەو شتانەی کە بە شێوەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر مرۆڤ هەیە، بە هەمان شێوەش رەنگدانەوەیان لەسەر بەرهەمی هونەری دەبینرێت. هەر بۆیە تابلۆ یان بەرهەمێکی هونەری دەبێتە شۆناسی نەتەوەیەک، بە واتایەکی تر ئەگەر سیاسەت بە مانای تەدبیرو عەقڵ بێت، هونەریش شێوەیەکە لە تەدبیرو عەقڵ کە بە ئاوێتەبوون بە هەست و سۆز هاوڕێیی ویستی هونەرمەند دەکەن و بە داهێنان دەتوانێت هەوڵ بۆ باشتر و جوانترکردنی دنیا بۆ مرۆڤ بدات. لە هەموو دەورەیەکدا هونەرمەند هەوڵی بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگا داوە، بەم پێناسەیە هونەر خۆی لە خۆیدا سیاسییە، بەلام ئەگەر سیاسەت بە درۆ و فێڵ و تەڵەکە مانا بکەین، ئەوە هونەری سیاسی نەبوونی قازانجی زیاترە چون هونەر لەم شێوەیەدا تووشی چوارچێوە و راسپاردن دەبێت، بە داخەوە لای ئێمە سیاسەت، هونەر وەک ئامرازێک بۆ پروپاگەندە بەکاردەهێنێت. دنیای هونەری ئێمەش بە باندبازی و خەلات،... رازاوەتەوەو پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵگادا پچڕاوە و بووەتە شتێکی تر کە من ناوی هونەری بازاڕی سیاسی و هونەری کارمەندی لێدەنێم. لەم بارودۆخەدا نە تەنیا گەشەی نەکردووە، بەڵکو لە رەوتەکەش جێماوە.

**بۆچی هونەرمەندان تووشی ئەم جۆرە لە هونەر دەبن؟**

کەسێک کە هونەرمەندی راستەقینە بێت، هیچکات تووشی ئەمە نابێت. هونەرمەند رۆح و ویژدانی کۆمەڵگای سەردەمە. هونەرمەند ناتوانێت هاوکات

هەم سادق و راستگۆ بێت، هەم درۆزن و هەم ئازا بێت و هەم خوێڕی،... ئەو کەسانەیش وا دەچنە ناو بازنەی هونەری سیاسی و کارمەندییەوە تەنیا لەبەر قازانجی تاکی خۆیانە. هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە رەخنەگرمان نییە خەڵک لێکۆڵینەوە لە بەرهەم و کارەکانیان ناکات، پانتاکە هی ئەوانەو بۆیان ئامادەیە. هونەریش وەک کەرەستەو ئامرازێک لە ژێر سێبەری سەرمایە و پلەوپایەدا لاواز بووە، کەسایەتی سستیش زۆر زوو بەمە کوڵ دەدات و دەچێتە ژێر سێبەری ئەوانەوە ... هونەرمەندانی راستەقینەش لەم بارودۆخە ئاڵۆز و بێکەسییەدا زۆر بە سەختی و چەرمەسەری ژیان دەبەنە سەر و کاردەکەن هەر وەک شاعیری گەورەی کورد مامۆستا هێمن دەڵێت: هونەرمەندو ژیانی خۆش مەحاڵە، بەداخەوە هونەرمەندی راستەقینەش لەم کەشەدا بە شێوە جۆراجۆرەکان وەلادەنرێ...

**هەڵبەت لە یەکێک لە پیشانگاکانتان بە ناوی (book art) کە بە شێوەی کتێب بەرێوەچوو، ئاماژەتان بە ئەخلاقی هونەری کردبوو، ئایا هونەرمەند لێرەدا ئەو سنوورە دەپارێزێت؟**

ئەخلاقی هونەری بەوە دەڵێن کە لەگەڵ خۆت راستگۆ بیت و بەڕاستی و دروستییەوە کاربکەیت، بوێرانە هەست و بیرت دەربڕیت و بەرهەمەکانت بخوڵقێنی. بۆ نموونە هونەرمەندان هەژار، شاملو، وانگۆگ، گۆیا، فریتز لانگ لەو هونەرمەندانەن، سنوور بۆ هونەرمەند دانانرێت. هونەرمەند بە پێی کەسایەتی خۆی ئەو سنوورە دەپارێزێت. هونەر بە سنوورداربوون وشکدەبێتەوە و دەکەوێتە دووپاتکردنەوەی رابـردوو. هونەر بە ئازادییەوە بەرەو دنیای تازەگەری و داهێنان دەڕوات.

**پێوەندی نێوان حەقیقەت و هونەر؟**

لە سەرەوەی هەموو راستییەکانەوە حەقیقەتی ئینسانبوون واتە من مرۆڤم دەبێ وەکو مرۆڤێکی راستەقینە بژیم، هەوێنی هونەری من ئەمەیە. ئەمڕۆ حەقیقەت لە بەرانبەری زۆرداران پارەو نابەرابەری لاوازو کزو لاڵ بووە کاتێک دەبینم لە سەرەتای هەزارەی سێیەمی زاینیدا بۆ پاراستن و بەرژەوەندی تاقمێک مرۆڤەکان بە پێشکەوتووترین کەرەسەکانی دنیا لەناو دەبرێن هونەرمەند ناتوانێت لە بەرانبەر ئەم بێدادییەدا بێدەنگ بێت و هەر لەم بارودۆخەدا هونەرو حەقیقەت یەک دەگرنەوە و ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ خۆی بەدەستەوە نەدات و خۆی لەخۆیدا پارێزەری ئەو هەستە ئینسانییە بێت.

**دەڵێن لە کۆمەڵگادا هونەرمەندان لەپێش خەڵکەوەن ئەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا هونەرمەند چۆن ئەو رۆڵەی گێڕاوە؟**

لە کۆمەڵگای ئێمەدا هیچ شتێک لە جێگەو پێگەی خۆیدا نەماوە. بەرهەمی هونەرمەندیش بە پێی ئەو شوێن و کاتەی کە تێیدا دەژی، دەخوڵقێت. نە لە داهاتوودا دەژی و نە بۆ داهاتوو کاردەکات، ئەگەر هەڵوێستیکێشی هەبێت بنەمای ئەو راوبۆچوونەی لەمرۆدایە. بەداخەوە خەڵکی ئێمە بە هۆی دژواری و ئەستەمبوونی ژیانیانەوە هەندێک لە رەوتی هونەری ئەمرۆی جیهان دواکەوتوون و هونەرمەندانیش لانیکەم لە رووی هونەرییەوە وەکو ویژدانی وریای کۆمەڵگا دەتوانن و لە توانایاندا هەیە پێشەنگ بن لە تازەکردنەوەی هوشیاری کۆیی و هونەرییانەی خەڵکدا.

**رای ئێوە سەبارەت بە مەرگی هونەر چییە؟**

«تا ئەو کاتەی مرۆڤ بژی هونەریش بـەردەوام هەیە، کە هونەر مرد مرۆڤیش لەناو دەچێت». میوەی ئینسان هونەرە لەو وەختەوە هونەری خولقاند، مرۆڤیش لە دایکبوو. کامبریج مێژوونووسی گەورەی بە ناوبانگ دەڵێت: (هونەر بوونی نییە، هونەرماندەکانن کە بوونیان هەیە) هەتا عاشق بین و هەست بە



ئازارو و دەردبکەین هونەر دەمێنێت، هەر شارستانییەتێک لە هەر هەلومەرجێکدا بێت بەدیهێنەری هونەری سەردەمی خۆیەتی. هونەر نەخۆش دەکەوێت، دووپاتدەبێتەوە و تووشی کۆما دەبێت، بەڵام هیچ کات لە ناو ناچێت.

**روانینی ئێوە بۆ راهێنان و پەروەردە بە چ شێوەیەکە و چۆن پێناسەی دەکەن؟**

هونەر لە دوو بەشی تەکنیک و داهێنان پێکهاتووە و دەبێت راهێنەری هونەر بەم دوو خاڵە گرینگی بدات، بەشی تەکنیک باسی خاڵ، رۆشنی و تاریکی و پێرسپێکتیوە.... دەکات. راهێنەریش تۆی پرسیارکردن، باوەڕ بە خۆبوون و هەست و تێگەیشتنی فەلسەفە، دەروونناسی، مێژوو و ئاگاداری لە کولتورو ئەو شتانەی کە پێوەندی راستەوخۆیان بە مرۆڤەوە هەیە لە ناخی قوتابیانیدا دەچێنێت و لەگەڵ شێوەکاری ئاشنایان دەکات و رێگای داهێنانیان بۆ رووندەکاتەوە. بەم جۆرەیە کە هونەری جیهان بەرهەمدێت، بەڵام ئەگەر هەر بە تەکنیک و کار بایەخ بدات، قوتابییەکانی لەو چوارچێوەدا مەحاڵە بە کەسایەتی هونەرمەندی بگەن و هونەر بخوڵقێنن، تەکنیک و داهێنان بەیەکەوە بە یارمەتی کۆمەڵگای پێشکەوت و رەخنەگرانەوەیە کە هونەرو هونەرمەند دەپشکوێن.

**شێوەکاری ئەم سەردەمە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

پێش ئەوەی بێمە سەر ئەو باسە تیشکێک دەخەمە سەر مێژوویی شێوەکاری کورد، کە من بە سێ قۆناغ دابەشم کردووە. قۆناغی یەکەم کە لە دەسەڵاتی مادو هەخامەنێشی و ساسانییەکانەوە دەستپێدەکات و تایبەتمەندی خۆی بنیات ناوەو بە شێوەکاری ئێرانی ناوی دەرکردووە و رۆژئاواییەکان ناوی مینیاتۆریان لێناوە. شێوەکاری کوردی ئاوێتەی شێوەکاری ئێرانییە و جیاناکرێتەوە و تا ئەمڕۆکەش تایبەتمەندییەکانی لە شێوەکاری ئێرانیدا بەدیدەکرێت. لەم قۆناغەدا دەتوانیین ناوی شێوەکاری کوردی لێبنێین، ئەم بەشە کۆی کوردستان لە دیار بەکرو موسڵەوە تا کرماشان دەگرێتەوە. لە قۆناغی دووەم و سێیەمدا من باسی شێوەکاری کورد دەکەم لە رۆژهەڵاتی کوردستان، چون لە بەشەکانی تری کوردستان شارەزاییەکی ئەو تۆم نییە. قۆناغی دووەم لە رۆژهەڵاتی کوردستان کە لە سەد ساڵی رابردووەوە دەستپێدەکات و بە شێوەکاری کلاسیکی کورد دایدەنێم مامۆستایان ناهید، قازی، نیکپەی، مستەفا شیرزاد و سالار ئاڵبلاغ و... هتد بە تواناو بەهرەی زاتی خۆیانەوە بەرهەمی هونەری بەنرخی شێوەکاریان بەم شێوازە خوڵقاندووە، کە بە بۆچوونی من ئەم بەرهەمانە ئاسەواری مێژوویی

و نەتەوەیی ئێمەن. قۆناغی سێیەم کە لە ژێر کاریگەری باری ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاشنا بوون لەگەڵ شێوەکارانی رۆژئاوا لە هەشتاکانەوە دەستپێدەکات و شێوەکاری ئەم سەردەمە پێکدێنێت. شێوەکاری ئەمڕۆی ئێمە هەروەها کە ئاماژەم پێدا ئەو شێوازانەن کە لە رۆژئاوا وەرمانگرتووە، لە ریالیزم و بگرە تا هونەری مۆدێرن و تا ئەمڕۆکەش ئەزموونی باشمان لێوەرگرتوون. هەروەها کە ئاگاداری شێوازو کولتوری نەتەوەکانی دیکەی دنیان، دەبێت بە هەمان شێوەش ئاگاداری هونەرو کولتوری کۆمەڵگەی خۆمان بین. بە تێکڵاوکردنی شێوازەکانی ئەوان لەگەڵ کولتوری خۆمان هونەرێکی نوێ بخولقێنین. شێوەکارانی ئەمڕۆی ئێمە لە باری مێتۆدۆلۆژیکییەوە جێگای دڵخۆشی و شادمانین، بەڵام بە داخەوە بە هۆی کۆمەڵێک فاکتەرەوە شێوەکاری ئەمڕۆ لە دووپاتکردنەوە و لاساییکردنەوەدا ماوەتەوە، کە هۆکارەکانی بریتین لە نەبوونی باسی فەسەفی، نەبوونی تیۆردارێژ .... هتد زاڵبوونی دنیای سەرمایەو ئابووری بەسەر هونەردا لە لایەکی دیکەوە زۆرینەی هونەرمەندان بۆ بەرژەوەندی تاکی خۆیان هونەری بازاڕی، توووریستیان هەڵبژاردووە و ئەم هەڵبژاردنانە چ راستەوخۆ چ نەڕاستەوخۆ بیانەوێ و نەیانەوێ دەچنە بازنەی پارەوە بە وتەی گەورەیەک (ئەو بارە لۆکە هەر لە دوورۆ قورسە) ژمارەیەک لەو هونەرمەندانە کە تازەگەری لە کارەکانیاندا هەیە، رەنگە بە بوونی کەشێکی نالەبار لە جێگەی خۆیاندا بمێننەوە، یان تەرکی هونەر بکەن، بەڵام هونەرمەندانی بازنەی پارە هەم لە ناڵ دەدەن و هەم لە بزمار بە ناوی سەداقەت و شەرافەت و هونەرمەندی خەڵکیش قەرزاربار دەکەن.

**ئێوە لە باسە پێشووەکاندا ئاماژەتان بە گرنگی رۆڵی هونەرمەند و کەسایەتی و کاریگەریی هونەرمەند لە کۆمەڵگادا کرد، بەڵام ئەم ئەرکە بە تەنیا لەسەر شانی هونەرمەند نییە و هەر کەسێک لە جێگەی خۆیەوە لە بەرانبەر کۆمەڵگادا بەر پرسە، بە تایبەت کەسانێک وەک دکتۆر، مامۆستا، پسپۆڕان و زانایان ..... ئایا ئەوان بە تەواوی رۆڵی خۆیان گێڕاوە؟**

بەڵێ راستە، سەیر بکەن گرنگترین پرس ئەمەیە کە ئێمە ئینسانین و لەمە زۆرترو گەورەتریشمان نییە کە بمانەوێت پێبگەین، هونەرو کولتورو زانست لە رێگای گەیشتن بە ئازادی هەنگاو دەنێن، هونەرمەند، دکتۆرو کرێکار،... هتد کاتێک وەکو مرۆڤ بۆ مرۆڤایەتی بژین دەتوانین بڵێین مرۆڤین. هەموو ئەمانەیش کە لە کۆمەڵگادا رۆڵیان هەیە دەبێت لەبەرانبەر کارێکدا کە دەیکەن بەرپرسبن

و زۆرو کەمی ئەمەیش لە سەر چاک و خراپەی کۆمەڵگا کاریگەریی زۆریان دەبێت کاتێک هونەرمەند، دکتور و مامۆستا..... وەک پارە چاو لە مرۆڤ بکەن چۆن دەتوانیت ناوی شەرەف و خۆشەویستی و وڵات ببەین. هونەرمەندێک قەڵەمەکەی بفرۆشێت دکتورێک لە نەخۆشەکەی ژێرمێزی وەرگرێت و یان ئەو کرێکارەی کە کارەکەی پشتگوێدەخات ئێوە بڵێین ناوی چی لێبنێنین (بەدبەختی، هەناسە ساردی، هەژاری....) ئێمە مەگەر مرۆڤ نین، بە وتەی شاعیری فارس سەعدی:

**بنی آدم اعضای یکدیگرند که در آفرینش زیک گوهرند**
**چو عضوی به درد آورد روزگار دگر عضوها را نماند قرار**
**تو کز محنت دیگران بی غمی نشاید کا نامت نهند آدمی**

ئێمە هەر کارو پیشەیەکمان هەبێت بۆ خزمەت بە شارو وڵات و ئینسان بە کاری دێنین و بۆ خۆمانی دەکەین، هیچ منەتی نییە. گەر تووشی نۆکەری پارەو پلەوپایە بین هەستی مرۆڤدۆستیمان دەڕزێت. بەم کارە لە پێشدا خۆمان و پاشان وڵاتەکامان وێراندەکەین. کارێکی عەقڵانی نییە کە هەست و فیکر و خۆشەویستیمان بخەینە ئەولاوە بیبەینە ژێر سێبەری دێوەزمەی سەرمایەدارییەکی بێ واتا. هەموو چینەکان لە بەرانبەری کۆمەڵگادا بەرپرسن، بەڵام ئەوانەی کە زیاتر و بە تواناترن، بارنەی ویژدانیان بە رێژەی ئەو زانابییەو توانابییە گەورەتر دەبێت.

**سەبارەت بە هونەری جیهانی چ بیرو بۆچوونێکتان هەیە؟**

هونەری جیهانی ئەوە نییە کە لە پاریس یان تۆکیۆ پێشکەش بکرێت. هونەری جیهانی ئەو هونەرەیە کە داهێنان و تازەگەری لە ناخیدا بێت و لە پێناوی ئاشتی و ئازادی و بەرابەری و مرۆڤایەتدا تێبکۆشێت. مەبەست شوێنی نمایشکردنی بەرهەمەکە نییە چ لە گوندێکی کوردەواریدا بێت، یان پایتەختی وڵاتێکی رۆژئاوایی ئامانجی من پەیڕەویکردنی ئەو چەمکانەیە کە باسمکرد .... ئەگەر داراستانێکی لای خۆمان لە سووتاندن رزگاربکەیت، وا بزانی خزمەتی ناوچەکەتت کردووە ئەمە کارێکی ناوچەییە، بەڵام وڵاتی خۆم بەشێکە لە دنیا و هەرچی ئەو بەشە ئاوەدانترو جوانتر بێت جیهان ئاوەدانتر دەبێت، بە رای من لە هونەریشدا بە هەمان شێوەیە. دەبێت بە تایبەتمەندییەکانی هونەری کۆمەڵگای خۆمەوە بچمە نێو ئەو رەوتەوە.

**پێناسەتان بۆ رابردوو و ئەمڕۆی هونەر بە چ شێوەیەکە؟**

بێگومان ئەگەر رابردوو نەبوایە ئێمەش ئێستا نەدەبووین، لە رابردووەوە هاتووین تا ئەمڕۆ، ئەمڕۆیشمان لە سەر داهاتوو کاریگەریی دەبێت. ئێمە بەردەوام، خەریکی ئەوەین کە ئەمڕۆمان بکەینە رابردوو و دا هاتوومان بکەینە ئەمڕۆ، بەڵام ئەگەر لەم رەوتەدا هەست و فیکرمان لە رابردوودا بمێنێتەوە هەروەک سەربازێک یەک دوو لێدەدەین. بەختەوەرانە ئینسان چارەنووسی لە دەستی خۆیدایە دەتوانێت بەرەو پێشی ببات. ئێمە ئەگەر هونەر و فەرهەنگی رابردوومان نەبوایە ئەمڕۆ زانست و فەرهەنگمان بە قەد منداڵیکی ناو بێشکە زۆرتر نەدەبوو و وەکو هونەرمەندێک دەبێت بە پشتیوانی رابردوو و بە دەرکی کات و شوێنێک کە تێدا دەژین بە هەست و هزر و فیکری خۆمان هونەری سەردەمی خۆمان بخوڵقێنین.



# سەعدوڵڵا نەسیری:
# زۆربەی سترانبێژانی ئێمە توانای مەقامچڕینیان نییە



**و. لە فارسییەوە: جەلال هانیسی**

گرفتی سەرەکی و جیدی ئەوەیە کە ئێمە مەقامزانمان نییە. بە دڵنیاییەوە دەبێت بڵێم نەوەد لە سەدی گۆرانیبێژان کە لە بواری مۆسیقادا چالاکی ئەنجام دەدەن، زانیاریی تەواویان لەسەر مەقامە کوردییەکان نییە، لە حاڵێکدا "مەقام" ژێرخان و بنەڕەتی مۆسیقای کوردییە.

مۆسیقای کوردی تەنیا ریتم و میلۆدی شاد بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی شاز و هەرەباش نابەستریتەوە. ئەم مۆسیقایە شێوەی جۆراوجۆری هەیە کە هەتا ئێستا بە چاکی نەناسراوە، رەنگە تەنیا لەنێو ئەم مۆسیقا نەناسراوە تەمووره بووە کە پشکی شێری بەرکەوتووە، دەکرێت بڵێین لە دەیەی رابردوودا توانیویەتی خۆی بە لایەنگرانی مۆسیقی بناسێنێت. بەشێکی فرەی لەم میراتە دێرینە بۆ ئێرانییەکان بە گشتی و بەتایبەتی بۆ ناوچە کوردنشینەکان کە مەقامی ئاوازی کوردی لەخۆ دەگرێت، هەروا نەناسراوە، ئەگەر جارجارە ئاماژەیەکی پێدراوە، جوانییە ئەفسووناوییەکەی هەمووان سەرسام دەکات و سەرەنجراکێشێشە. ئەم بەشەی لە مۆسیقای کوردی هێشتا بە شاراوەیی ماوەتەوە کە زۆربەی "دابەشکاران"- ئاهەنگساز- و گۆرانیبێژانی ناسراوی کورد بە هەند وەریان نەگرتووە بایەخیان

پێ نەداوە، تەنیا بۆ چێژی هارمۆونی و بەرزیی و نزمی لەبەر چاو گیراوە.

بێگومان سەعدوڵڵا نەسیری یەکێک لە بژاردە باشەکانە بۆ باسکردن لە بواری مەقامات و ئاوازی کوردی و پرسی دەوروبەری ئەم سترانە دێرینانە. گۆرانیبێژ و ژەنیار و ئاوازدانەری سنەیی هەتا ئێستا لەم بوارەدا کاری زۆری ئەنجام داوە کە زۆر بەنرخ و پڕ بایەخن.

سەعدوڵڵا هەر لە سەرەتاوە لەم بەشە نەناسراوەدا قاڵ بووەتەوە، کە لە ئەلبوومەکانی" ژوان" دیوان ١و٢و٣ "دیواخ"، "دیلان" و هتد... بەشێوەی جیدی دەستی کرد بە چڕینی مەقاماتی کوردی، هەروەها گۆشەگەلێکی جوانی ئەم وڵاتە مۆسیقایەی بە خەڵکی ناساند.

سەعدوڵڵا لەمیانەی قسەکانیدا ئاماژەی بە خاڵێکی گرنگ کرد کە ئەگەر سەرنجی پێ بدرێت، دەکرێت زۆر کەڵکی لێوەربگیردرێت، لە درێژەدا قسەکانی ئەم هونەرمەندە سەبارەت بە مۆسیقی مەقامی کوردی دەیخوێنینەوە.

**کاک سەعدوڵڵا، مۆسیقای کوردی مۆسیقایەکی زۆر دەوڵەمەندە لە مۆسیقای مەقامیدا بەشە ئاوازییەکانی وەک: هۆرە سیاچەمانە، حەیران، لاوک، مۆر و چەمەری هەروەها نەغمەگەلێکی تری بوکر و دێرینمان هەیە کە هەرکامیان بە تەنیایی خاوەنی پتانسیەلێکی زۆر بەرزی مۆسیقایین، ئەم میراتە تا چ رادەیەک بۆ ناوچەکانی تر ناسراون؟**

ئەگەر مۆسیقای کوردی بە دوو بەشی تیۆری و کردەیی(عملی) دابەش بکەین، لە بەشی تیۆریدا کارێکی باش و بەکەڵک کە شایانی مۆسیقی مەقامی بێت، نەکراوە، بەڵام لە بواری کردەییدا جێگە و پێگەیەکی باشی هەبووە، لە هەر کونجێکی ئەم جیهانە ببیسی بە تەواوەتی لە مۆسیقاکانی دیکە جیاوزەترە. ئەم پێناسە و خەسڵەتە بەهۆی سێ بەشی تایبەتییەوە لە مۆسیقای کوردیدا، کە مۆسیقای "ئاوازی و مەقامی" "میلۆدی" و "ریتم" لەخۆ دەگرێت، ئێمە گەلێ ریتممان هەیە کە تایبەت بە ناوچە کوردنشینەکانە بۆ وێنە ریتمی "هەفت هەشتە"، کە گەڕیانی پێ دەڵێن، کە لە هەر جێگایەک بیڵێنەوە، دەزانرێت کە ئەمە کوردییە و دیارە، چونکە ئەم ریتمە تەنیا لە ناوچە کوردنشینەکاندا باوە.

لە باشوور هەتا باکوور پێ لە هەر ناوچەیەک بنێی قوتابخانەی تایبەت بە خۆی هەیە. بۆ وێنە "هەورامان" و "کرماشان" هەرکام خاوەنی قوتابخانەی مۆسیقای خۆیەتی، ناوچەی "سنە" و "چەم شار" و دەوروبەری بۆ خۆیان قوتابخانەیەکن. ناوچەی "هەولێر" و "گەرمیان"یش خاوەنی قوتابخانەن. لە باکووری کوردستان

چەند قوتابخانە هەن کە یەکێکیان قوتابخانەی "یەزیدییەکانە" کە کاریگەریی زۆری بەسەر مۆسیقای تورکییەوە هەبووە، کوردەکانی خوراسانیش قوتابخانەی تایبەت بە خۆیان هەیە، تەنانەت لە ناوچەکانی "بەلووچستان" و "ئەفغانستان"دا مەقامگەلێ هەن کە بە مەقاماتی کوردی ناسراون، ئەم قوتابخانانە زۆر بەربڵاون ئەگەر بمانەوێت بە شێوەی جیاجیا باسیان بکەین زۆر دەخایەنێت.

**دەکرێت باسی جێگەوپێگەی مۆسیقای کوردی لە ئێراندا بکەی؟**

ئەم مۆسیقایە نابێت تەنیا لە چوارچێوەی جوگرافیای ئێراندا چاوی لێ بکرێت، بە بڕوای من مۆسیقای کوردی بەهۆی فرە چەشنی بوونی میلۆدییەوە دەوڵەمەندترین مۆسیقییە، نەک تەنیا لە ئێراندا، بەڵکو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا.

**تایبەتمەندیی و خسڵەتی ئەم مۆسیقایە چییە؟**

لە کوردستاندا دوو جۆرە مۆسیقامان هەیە، مۆسیقای شاری و مۆسیقای گوندی. لەم میانەدا مۆسیقای گوندی زۆر دەوڵەمەند بووە و بنەڕەتی مۆسیقای شاری پێک دێنێت، هەروەها بەهۆی سەغڵەتیی هاتوچۆی گوندەکان کە رەنگە هەتا بیست، سی ساڵی پێش ئێستا بڕێکیان جادەیان بۆ نەکێشرابوو، زۆربەی لە میلۆدییە باوەکان لەم ناوچەگەلە بوکر و دەست لێ نەدراو ماونەتەوە.

بەشی ئاوازی مۆسیقی شاری کە دەکرێت بە مۆسیقای کلاسیکی کوردی ناوی لێ بنێین- لە سەردەمی سەیدعەلی ئەسغەری کوردستانییەوە دەستی پێکردووە.

بنەچە و بنەڕەتی مۆسیقای سازی کوردییش بۆ مۆسیقی مەقامی تەموورەی یارسانەکان و ناوچەی کرماشان دەگەڕێتەوە.

مۆسیقی کوردی زۆر دەوڵەمەندە و بەسەر مۆسیقای تورکی، عەرەبی و فارسییدا کاریگەریی هەبووە و بەهێزی کردوون، لە ئێراندا کوردەکان هەمیشە باشترین ژەنیار بوون، لە ئێراق و تورکیاشدا هەر بەم شێوەیە بووە، ئەمە نیشانەی هێز و توانای مۆسیقای کوردییە.

من لە کارەکانمدا هەوڵم داوە ئەو مەقامانەی کە لەبیر چوونەتەوە هەر بەو شێوە و ستایلە رەسەنە بیان چڕمەوە، دەتوانم ئاماژە بە چەند مەقامێک بکەم: مەقامی "سۆزی خانەقایی" (کە مەلامحەمەدی رەبێعی) پاراستوویەتی مەقامی "هەرا" یان مەقامی "دەرەیێ"، کە ئەمانەم لە ئەلبوومی"دیوانی ١و٢دا چڕیومە.

**هەروا کە وتت مۆسیقای کوردی زۆر دەوڵەمەندە ئایا کارێکی شایستە و سەرنجڕاکێش وەک ئەوەی کە لە مۆسیقای رەسەنی ئێرانیدا کراوە لە بواری مۆسیقی مەقامی کوردیدا ئەنجام دراوە؟**

پێم خۆشە لەم بوارەدا نموونەیەک بهێنمەوە، تۆ وای دابنێ لە ناوچەیەکدا سەرچاوەیەکی گەورەی نەفتی خاو هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە سەرچاوەیەکی نەتەوەیی زۆر پڕبایخە، بەڵام گرنگتر ئەوەیە کە توانایی جیاکردنەوەی مەوادی نوێی لەم مادەدایە، سەرچاوەکانی مۆسیقی لەم ناوچەیە زۆرپڕ بایەخن، ئەم مۆسیقایە بە رادەیەک دەوڵەمەند و بەربڵاوە کە تەنانەت میوزیک زانانی گەورەی ئێمەش نەیانتوانیوە ئەم سەرچاوگەلە کۆ بکەنەوە، ئەڵبەتە لەم ساڵانە کۆمەڵێ کاری بەرچاو کراوە، بۆ وێنە باشترین کارێ بەشێوەی سازی کراوە هی "عەلی ئەکبەر مورادیە"، کە هەموو مەقامەکانی تەموورەی کۆکردووەتەوە و بە ناوی مۆسیقی مەقامی کوردستان ناساندوویە کە کارێکی گرانبەها و دانسقەیە.

لەنێو ئەم گرووپانەی ئێستاشدا "پوورنازرییەکان"، "کامکارەکان" و عەندەلیبییەکان رۆڵێکی باش و بەرچاویان لە مۆسیقای کوردیدا هەبووە و توانیویانە کارگەلێکی بەپێز بخەنە بەرچاو.

کۆمەڵێک گرووپی تازەش هەن کە برێ کاریان لەم بوارە ئەنجام داوە.

ئەنیستیتوی کەلەپووری کورد لە شاری سلێمانی بە سەرپەرشتی مامۆستا "مەزهەری خالەقی" کۆمەڵێ کاری باشی کردووە، بۆ نموونە: کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی هونەرمەندانی گەورەی وەکو "عارف جزراوی"، "مامۆستا عەلی مەردان"، "عایشەشان" و "حەسەن زیرەک"، تەنانەت "نوتە"کانی مۆسیقای فولکلۆری ناوچەکانی کوردستانی سووریەیان کردووەتە کتێب.

**بە رای بەڕێزت ئایا ئەم کارانە کافیین؟**

نا، بە هیچ شێوەیەک. کار لەم بوارەدا زۆر بەربڵاوە و چالاکی و ماندووبوونی زۆرتری دەوێت، ئەم کارە ئەنجامدراوانە وەک هەڵگرتنی گۆزەی ئاوە لە دەریا، واتا ئەگەر مۆسیقای کوردی بە دەریا بچوێنین ئەوەی کە کۆمان کردووەتەوە بەقەدەر ئاوی گۆزەیەکە، مۆسیقای کوردی رەهەندی تەخەسووسییش لەخۆ دەگرێت، بۆ وێنە لەم مۆسیقییە بۆ دەرمانی برێ لە نەخۆشییەکان وەکو ژانەسەر و نەخۆشی دڵ کەڵکی لێوەر دەگیرێت، هەروەها لە رابردووشدا شمشاڵژەنمان هەبووە کە بۆ زاینی ژن شمشاڵیان لێداوە بۆ ئەوەی زاینەکەی ئاسانتر بکاتەوە و تەسکینی دەردەکەی بێ.

ئەڵبەتە هەرچەندە بەنیسبەت بەربڵاوی مۆسیقای کوردی کارگەلێکی زۆر نەکراوە، سەرەڕای گرفتی فیکری و گرفت و کێشەی ئابووری بڕێ کار کراوە ئەوەش جێگای دەستخۆشییە.

**کۆمەڵێک تیپ کە لە بواری مۆسیقی کوردیدا کاردەکەن، زیاتر خۆیان خەریکی ستران و میلۆدییە فولکلۆرەکان دەکەن وەکو"هەروایە"، "پەپووسلێمانە" و لەیلێ لەیلێ، تەنانەت لە بواری تەمووڕەشدا مەیل بەرەو لای ئاواز نیشان دراوە تا مەقامە ئاوازییەکان، هۆکاری پێشوازی نەکردنی تیپەکان بۆ مەقام چییە؟**

یەکێک لە گرفتە جیدییەکان ئەوەیە کە ئێمە گۆرانیبێژی مەقام چڕمان نییە، بە راشکاوییەوە دەڵێم نەوەد لە سەدی گۆرانیبێژان کە لە بواری مۆسیقای کوردیدا چالاکن، مەقامەکان ناناسن، لە حاڵێکدا مەقام بناغە و بنەڕەتی مۆسیقای کوردییە، خۆم لەو ئەلبوومانەی کە بڵاوم کردوونەتەوە، مەقامێ یا دوو مەقامم بە تەواوەتی چڕیوە هەموو گوشەکانیشم تەی کردووە، لە ئەلبوومی ئاخریشمدا بە ناوی "دیواخ" مەقامێکم بە ناوی "قەتاری کوردی"، کە ئاماژە بە "بەیاتی زەندە" دەکات، چڕیوە، کە کامڵترین چڕین ئەم مەقامە بووە، هەروەها پێشنیارم بە چەند جێگە داوە کە مەقامە کوردییەکان تۆمار بکەم، بەڵام بەداخەوە کەس ئامادە نەبووە پشتیوانی ماڵی ئەم پرۆژەیە بکات، چونکە ئەم کارە دە ساڵ وەختی دەوێت.

**لە ساڵانی پێشوودا گەلێ کۆنسێرت تایبەت بە مۆسیقای کوردی کراوە- تەنانەت ئەوانەش کە لە تاران بەڕێوە چوونە- هەرکات تیپەکان مەقامیان چڕیوە پێشوازیی زۆری لێ کراوە، سەرەڕای پێشوازیی خەڵک بۆچی مەقام وتنەوە بەردەوامی نییە؟**

زۆر راستە، بە راستی مەقامەکانی ئێمە سەرنجڕاکێش و چێژی تایبەتیان هەیە کاریگەییان هەیە و لایەنگریشی زۆرە، وتنی مەقام زۆر سەختترە لە ستران، هێزی دەنگ و لێزانینی گەرەکە، تەنانەت مەقام چەندین بەرابەر لە ستران کاریگەرترە، ئەم ئەزموونەم لە کۆنسێرتێکی دەرەوە هەبووە، چەنێ لەمەوبەر کۆنسیرتێکم لە ئەورووپا بوو کە خەڵکەکە زیاتر لە مەقامەکان پێشوازییان کرد چۆن بە لایانەوە شتێکی تازە بوو.

**لە رابردوودا زیاتر گۆرانیبێژ بەرچاو بووە و خەڵک بەرهەمەکانیان هەر بە ناوی ئەوەوە دەناسی، بەڵام لە دەیەکانی پێشدا مۆسیقای کوردی بە راشکاوی**

**بەرەولای مونەلیف (ئاهەنگساز) ناسین هەنگاوی ناوە ئەم ئالوگۆڕە وەدیهاتووە تا چەندە بە لای خەڵکەوە پەسەندە؟**

بەداخەوە خەڵکی ئێمە بە دەنگی گۆرانیبێژ راهاتوون. لە ناوچەی کوردەواریدا هێشتا گۆرانیبێژ بەشێوەی سەرەکی دەناسرێت و رەنجی ژەنیار لە بەرچاو ناگیردرێت، لە حاڵێکدا بەشی سازییەکەی ئێمە زۆر دەوڵەمەندە و قسەی زۆری بۆ وتن هەیە، خەڵک دەبێت رابێن بە مۆسیقی بێ کەلام خۆ بگرن، ئەڵبەتە من لە پەنای گۆرانیوتندا کاری ژەنین و ئاهەنگسازیش دەکەم، بەشێکی زۆری چالاکیم بۆ مۆسیقای سازی تەرخان کردووە، رەنگە من یەکەم ژەنیار بم کە بە "دیوان" هەفت هەوا(دەستگا) مۆسیقییەکەم ژەندووە.

**لە مۆسیقی رەسەنی ئێراندا بەشێک هەیە بەناوی ئاواز، کە بتەوێت و نەتەوێت گۆرانیبێژ رۆڵی سەرەکی دەبینێت، بەلام لە مۆسیقای کوردیدا بە هۆی زاڵبوونی مەقام و بێ ریتمی بوونی دەرفەتی رۆڵبینین بۆ دەنگبێژ ناهێڵێتەوە. لە لایەکی ترەوە لەم ساڵانەدا گۆرانیبێژ لە تیپەکانی وەکو "شەمس" یا "کامکارەکان" تەنانەت ئەو گرووپە گەنجانەش جێگە و پێگەیەکیان پتر لە ژەنیارێک نەبووە، گۆرانیبێژ دەبێت بە سەلیقی دەست و پێ گیری ئاهەنگساز بێت، بە رای تۆ بەرەوپێشچوونی ئەم رەوالە بە جێگە و پێگەی سترانبێژ لەتمەی نەداوە؟**

ئەگەر بمەوێت دابەش و پلە بەندیی بکەم، ئەگەر گۆرانیبێژ مەقام نەزانێت بە گۆرانیبێژی چاک نایەتە ئەژمار. کەسێ کە لە هەوراز و نشێوەکانی هەوراماندا چاک شۆفێری بکات لە شەقامدا ئاسانە بۆی، زۆربەی گۆرانیبێژان توانای چڕینی مەقامی کوردیان نییە، کە ئەمە زیانی لە مۆسیقای کوردی داوە، تەنانەت ژەنیارەکانی ئێمە لە ژەنینی مەقامدا توانایی ئەوتۆیان نییە، لە ئەلبوومی "ژوان"دا کاک "سەعید فەرەج پوور"، کە یەکێکە لە ژەنیارە بە تواناکانی ئێران هاوکاری کردووم، لە گۆرانییەکاندا هەماهەنگییەکان بە ئەستۆی ئەو بوو، بەلام لە چڕینی مەقامدا خۆم رشتەی کارەکەم بە دەستمەوە بوو و رێنوێنی کارەکە بە من بوو. ئەگەر کەسێ گوێ لەو بەرهەمە بگرێت لە بەشی مەقامەکەدا دەنگی دیوانەکە (ساز) بە روونی دیارە.

**بە واتایەکی تر دەکرێت بڵێین کە بەهۆی شارەزایی نەبوونی گۆرانیبێژ لە چڕینی مەقامدا بووەتە هۆی لاوازبوونی پێگەی گۆرانیبێژ؟**

بەڵێ وایە، لەناو گۆرانیبێژانی کوردا کەسانێ وەک "بەهجەت یەحیا" یا

"عەدنان کەریم" گۆرانیبێژێکی زۆر چاکن، بەڵام مەقامبێژ نین و ئەو مەقامانەیان کە وتوویانە نیوە و ناتەواون، هەروا کە مامۆستا "مەزهەری خالەقی" دەڵێت: نیوە -هومایونی، نیوە سێ گایەک - یان تۆزێک بەلای مەقامدا چوونە. مەقام دەبێت پلەکانی تەی بکرێت و حەقی خۆی پێ بدرێت، مامۆستا "عەلی مەردان" پلەی مەقامەکانی بە تەواوەتی تەی کردووە، ئەم شێوە چڕینە گوێگر تێر دەکات و چێژی پێ دەدات، "سەیدعەلی ئەسغەری کوردستانی" لە ماقامی "زەردی خەزان" کە لە "بەیاتی زەند" دایە گوێگر تژی دەکات لە چێژ و هەست.

کارێکی هەڵەیە کە گۆرانیبێژێ بە وتنی چەند گۆرانی و بڵاوکردنەوەی ئەلبوومێکی بازاڕیی ناو و ناوبانگێ بەدەست بێنێت، ئەم کەسانە بە ئەنجامدانی ئەم کارە لاوەکی و تەمەنکورتەوە، هونەری ڕەسەنی کوردییان بە گاڵتە گرتووە.

وتنی گۆرانی زۆر ئاسانە، تەنانەت نەوەد لە سەدی خەڵکی کورد دەتوانن گۆرانی بڵێنەوە، چونکە مۆسیقا لە ڕەگ و خوێنیاندایە، بەڵام مەقام بە ئاسانی ناوترێت، چونکە زەحمەت و پرۆڤەی زۆری دەوێت، من بۆ فێربوونی تەحریرێک (زەخرەفە) لە مەقامێکدا زیاتر لە دوو مانگ پرۆڤەم کرد تا دروست بیچڕم، ساڵێکی ڕێک تەمرینم کرد تا "مەقامی ڕاست"م بە جوانی چڕی، دەبێت فۆنۆتیکی شیعر و لەحنی سازەکان دروست بن، تەنانەت بڕێ جار ئەو ژەنیارانەی کە هاوکاریم دەکەن تووڕە دەبم، زۆرم هەوڵ داوە لە گەڵیاندا تا ئەو مەقامە حەقی خۆی پێ بدرێت.

گۆرانیبێژێک کە سەوادی مۆسیقای نەبێت، ژەنیار خەتی پێ دەدات، بەڵام ئەگەر سەوادی مۆسیقای هەبێت، ئەو دەتوانێت خەت بە ژەنیار بدات، لە کۆنسێرتەکانمدا دوو دانە لە ئامێرەکان دەنگی فەرقی دەکرد پێم وتن گرفتەکە چارەسەر بکەن، چونکە گوێچکەم بە مۆسیقا ئاشنایە و پەردەکان دەناسم.

**سەرەڕای ئەم ستانداردانەی کە باست کردن لە تیپە مۆسیقییەکانی کوردیدا، مەقامبێژمان هەیە؟**

من کەسێکی وەها بەم تایبەتمەندییانەوە لەنێو گرووپە چالاکەکانی مۆسیقای کوردیدا ناناسم. لە مۆسیقی شاری و مەقامی خۆماندا کەسێک هاوتەرازی گۆرانیبێژی ئێرانیمان نییە، هەموو گۆرانیبێژن، ئەگەر مەقامێکیان چڕیبێت بەشێوەی نیوە و ناتەواو بووە. ئەڵبەتە لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا لە بەشی مەقامدا دەنگبێژی باشمان هەیە، ماوەیەک لەمەوپێش دوو مەقامم لە "مستەفا دادار" بیست دەرکەوت کە مەقام بێژێکی باشە. لە ناوچەی هەورامان

و کرماشان-یشدا هەم سیاچەمانە بێژ و هەم هۆرە چڕی بەتوانا و چاکمان هەیە، کاک "ئاسری رەزازی" لەم کارە نوییانەیدا بە پێچەوانەی پێشوو مەقامی نەوتووە. لەناو گۆرانیبێژەکاندا "شەهریبان" مەقامی "لاوک" چاک ئەدا دەکات. "شوان پەروەر"یش لە وتنی "لاوک"دا باشە، بەڵام دەنگی ئەو بۆ "ئەڵاوەیسی و مەقامی راست" نابێت.

**لە ئەلبوومەکانتدا جگە لە خۆت لە گۆرانیبێژانی تر گەلێک وەرناگری، هۆکاری ئەمە چییە؟**

ئەم کارە هۆکاری زۆری هەیە، گۆرانیبێژێکی کوردم پێ نیشان بدە کە بەسەر مەقاماتی کوردیدا زاڵ بێت، من لەم ساڵانەدا ویستوومە برێ کار بۆ گۆرانیبێژانی ناودار ئەنجام بدەم، بەڵام پەشیمان بوومەتەوە، هەرچەندە ئەمانە کارەکانیان باشن، بەڵام کارە مەقامییەکانیان بە دڵی من نەبووە.

**ڕووداوێک کە لەم دواییانە لە مۆسیقای کوردیدا رووی داوە چڕینی مەقاماتی کوردی لە چوارچێوەی دەستگای رەسەنی ئێرانیدایە، بەڕێزت وەک کەسێک کە لەم بوارەدا کاری زۆرت ئەنجامت داوە ئایا ئەزموونێکی وەها زیانێکی بە رەسەنایەتی کوردی لە مەقامدا نەداوە؟**

پێم وانییە، ئەم کارە گرفتێک دروست ناکات توانایی مۆسیقایی ئێمە نیشان دەدات، هەموو ئەو مێلودی و مەقامانەی کە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست باون، لە هەفت دەستگا (هەوا) مۆسیقایی بەدەر نین، لە وڵاتی کوردەواریشدا هەموو مێلودی و مۆسیقییە فولکۆرییەکان لە چوارچێوەی ئەم هەفت دەستاگایەدان، ئەڵبەتە زاراوەی مۆسیقی ئەم ناوچانە هەرکام جیاوازییان هەیە، وەکو قسەکردن بە زاراوە و زمانی جیاوازی باو لەم ناوچەدا، گرنگ پاراستنی زاراوە و ئەم مەقامات و مێلودییانەیە، دەنا تورک و عەرەبیش ئەم دەستگاگەلەیان هەیە کە لە ئێراندا بەشێوەی بەربڵاو کۆکراونەتەوە.

**هەندێک جار ناوازگەلی مۆسیقایی وەکو "سیاچەمانە" و "هۆرە"یان بە جیاواز زانیوە لە مۆسیقای ئێرانیدا، تەنانەت لە هەندێک کاتدا بە فالۆری دەزانن؟**

وانییە، تەنیا زاراوە جیاوازیی هەیە، ئەم قسەگەلە زانستی نین.

**کاک سەعدوڵڵا بەربڵاویی و پەرتەوازەبوونی مەقاماتی کوردی لە ناوچە**

**کوردنشینەکاندا زۆرن و بڕێک مەقامات وەک "حەیران"، "سیاچەمانە"، "لاوک" و مۆر هەرکام تاڕادەیەک بۆ ناوچەکانی تر بەباشی نەناسراون لەنێو خۆشماندا ئاڵوگۆڕی مۆسیقیمان نییە، کارگەلێ لەم چەشنە بە ئەستەم دەستی هۆگران و لایەنگرانی دەگاتە چ ڕێکارێک بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە پێشنیار دەکەیت؟**

من پێشنیارم بە مامۆستا "مەزهەری خالەقی"دا کە بەرهەمی هەموو میوزێک زانانی کورد چ لە بەشی سازیدا و چ لە بەشی ئاوازیدا تۆمار بکرێن و بنووسرێن، ئەڵبەتە ئەم پرۆژەیە کارێکی زۆری دەوێت، دەبێت ئەم بەرهەمانە لەپێشدا تۆمار بکرێن و دواتر وەکو ئاوازی ئێرانی بەشێوەی نۆتە بنووسرێن، تا ئەگەر کەسێ لە باشوور و باکووری کوردستان خوازیاری ئەنجامی کاری تەخەسووسی و زانستی بێت، کە لە هەر بەشێک لەم میراتە مۆسیقایە وەکو "لاوک"، "حەیران"، "سیاچەمانە" و "هۆرە" مەوادی خاوی بۆ فەراهەم بێت.

ئەنجامی ئەم کارەیش پەرە بە مۆسیقای مەقامی کوردی دەدات و بۆ فێربوونی زاراوە جۆراوجۆرەکان ڕێگەخۆشکەرە، ئەڵبەتە لەم ساڵانەدا بەهۆی پەرەسەندنی ماڵپەڕە ئینتەرنێتییەکان و میدیاکان و هاتنە مەیدانی کەرەسەکانی دەنگ و ڕەنگ، خەڵک باشتر دەستیان بە بەرهەمەکان دەگات، ئێستا "هۆرە"، حەیران"، "لاوک و سیاچەمانە" ئیدی نامۆ نین، تەنانەت هەندێک لە دەنگبێژەکان لە باکووری کوردستان گۆرانی شێوە زاراوەکانی سۆرانی یان کەڵوڕی دەڵێنەوە، یا بوێژانی کەلوڕی سترانگەلێ لە زاری هەورامی و سۆرانییەوە دەچڕن، هەر کە بەگوێرەی توانایی خۆی دەبێت لەم ڕێگەیەدا هەنگاوێ هەڵبێنێت، من وەکو گۆرانیبێژێکی سنەیی بە باشی دەتوانم "هۆرە"، "سیاچەمانە"، "حەیران" و مەقاماتی خانەقایی بڵێمەوە، ئەم پێوەندییە خۆشبەختانە تا ڕادەیەک جێ کەوتووە.

**کاک سەعدوڵلا وەکو دوا پرسیار، داهاتووی مۆسیقی مەقامی و فولکلۆری کوردی چۆن دەبینن؟**

لە بارودۆخی ئێستادا زۆربەی مەقامبێژە ڕەسەنەکانی ئێمە تەنانەت ژەنیاری سازەکانی وەکو "نەرمەنەی" (باڵەبان) "دەهـۆڵ" و "سوڕنا" هەرکام بەهۆی گرفتی مادی خەریکن لەبیر دەچنەوە، لە وڵاتی ئازەربایجاندا شوێنگەلێک بە ئیمکاناتی زۆرەوە بۆ ڕاهێنانی ژەنیاری "باڵەبان یان دەهۆڵ" دانراون. تەنانەت لە ئازەربایجانی ئێرانیشدا ژەنیارگەلێ باش لەم بوارەدا هەن، بەداخەوە لە کوردستاندا جگە لە دوو سێ کەس، دەهۆڵژەنی باش و لێزانمان نییە، یا جیلی "ژەنیاری زەربی" محلی(خۆجێی) و "زەربی تەنەکەیی"، کە دەنگی تایبەت بە خۆی

هەیە خەریکی لەناو چوونن.

خاڵێکی گرنگتر ئەوەیە زۆربەی خەڵکی ئاسایی مۆسیقی بازاڕی و جیدی لێک جیا ناکەنەوە، ئەڵبەتە ئەم بەرهەمە بازاڕییانە وردە وردە بایەخی خۆیان لە دەست دەدەن، مۆسیقی بەرجستە و ناوازە بە زیندوویی دەمێننەوە، هەتا ئێستا گۆرانیبێژانی گەورە هاتوونەتە بوارەکەوە و رۆیشتوون، بەڵام تەنیا ناوی هونەرمەندانی گەورەی وەکو "سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی"، "عەلی مەردان"، "سیوە" حەسەن زیرەک، ماملێ و مەزهەری خالەقی و هتد... بە زیندوویی ماونەتەوە، ئەگەر کەسانێ دەیانەوێت کاری جیدی بکەن، گوێ لە کاری ئەم کەسایەتیانە دەگرن، ئەوانی تر سەرەڕای بەناوبانگبوونی کاتیان لەبیر دەچنەوە، ئەڵبەتە سەرەڕای ئەم هەموو تەنگەژەو گرفتانە داهاتووی مۆسیقای کوردی گەش دەبینم.



**سەرچاوە:**

www.kurdpress.com/Fa/NSite/FullStory/News/?Id=21525#Title




سازدانی: شاهین بەهرامی
و. لە عەرەبییەوە: ئەکبەر حەسەن

**با لە ئەزموونە سەرەتاییەکانتەوە لە بواری فیلمسازیدا دەستپێبکەین. کارکردن لە دیزاینی پێشەکی فیلمی قەیسەر لە ساڵی ١٩٦٩ یەکێکە لە فیلمەکانی شەپۆلی نوێی سینەمای ئێرانی. ئایا دەتویست رێگای خۆت بەرەو دەرهێنانی فیلم بکەیتەوە؟**

نەخێر، هەرگیز. لەو کاتانەدا سەرقاڵی وێنەکێشان و پاشان دیزاینی گرافیکی بۆ پروپاگەندەو رێکلام بووم. لەو کاتانەدا دیزاینکردنی پێشەکیی (لەگەڵ ناوی ئەو کەسانەدا کە لە فیلمەکەدا کاریان دەکرد) باو بوو. کارەکانی (سۆل باس)ی ئەمریکی، بە تایبەتی لەم بوارەدا، سەرنجڕاکێش و داهێنەرانەبوون. کارەکانی ئەو کاریگەریی لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندانی گرافیک و دەرهێنەرانی ئەو کاتە دانا. من لەو کاتانەدا کەمێک شارەزاییم هەبوو بەهۆی کارکردنم بە کامێرایەکی ٣٥ ملم لە هەندێک لە رێکلامە تەلەفزیۆنییەکاندا، کە خۆم جێبەجێم دەکردن.

ئەمە، لە روانگەی هونەرمەندێکی گرافیکییەوە، رووبەڕووبوونەوەیەکی سەرنجڕاکێش بوو. قەیسەر کاری دووەمم بوو. پێموایە لە دوای قەیسەرەوە چوار یان پێنج پێشەکیی دیکەم دیزاین کرد تا ئەو کاتەی دەستم بە دەرهێنانی فیلمەکانم کرد. لەبەر ئەوە دەتوانم، لە ئەزموونی خۆمەوە، بڵێم دیزاینکردنی پێشەکیی فیلم پردی نێوان هونەری گرافیکیو سینەمایە. لەمڕۆدا حەز دەکەم کەسانی دیکە پێشەکیی فیلمەکانم دیزاین بکەن، چونکە خۆم سەبرو تەحەمولی ئەوەم نەماوە.

**ئایا دەتوانین بڵێین فیلمی یەکەمت (نانو کوڵان-١٩٧٠) شێوازی تێگەیشتنی تەکنیکیو ئیستاتیکی تۆ لە فیلمسازی پیشان دەدات؟ ئایا سیناریۆی ئەم کورتەفیلمە، کە براکەت نووسیوویەتی، لە بونیادی فیلمەکەدا بەشداریی کردووە؟**

لەو کاتانەدا، کۆتایی شەستەکان، من لە سەنتەری گەشەدانی هزری بە منداڵانو گەنجان کارم دەکرد. زۆر سیناریۆم خوێندەوە، بەڵام ئەم دەقە سەرنجیراکێشام. بە تایبەتی هێڵە زەمەنییە یەکخراوەکە سەرنجڕاکێش بوو. ماوەی چیرۆکەکە خۆی تەنیا ١٢ خولەک بوو، کەواتە پێویستی نەدەکرد زەمەن هەڵبوەشێنرێتەوە. بەڵام خۆم هەستم بەوە دەکرد کە هەڵوەشاندنەوەی چوارەچێوەی زەمەنی لەپێناوی پیشاندانی تێپەڕینی کاتدا وای لە دەرهێنەرەکان دەکرد خۆیان بدەن بەدەست عورفو چوارچێوەکانەوە. بەم شێوەیە، لێکنزیککرنەوەی کاتی سینەماییو کاتی راستەقینە تا ئەو رادەیەی شیاوە بەبێ ئەوەی عورفەکان بخرێنەگەڕ، رووبەڕووبوونەوەیەکی سەرنجڕاکێش بوو بۆ من.

(نانو کوڵان) یەکەم ئەزموونی سینەمایی من بوو. دەبێت دان بەوەشدا بنێم ئەزموونێکی سەخت بوو. دەبوو لەگەڵ منداڵێکی بچووک، سەگێکو ستافێکی هونەریی ناپرۆفیشناڵدا کاربکەم، جگە لە وێنەگرێک کە بەدرێژایی کات پرتەو بۆڵەو سکاڵای دەکرد. لە هەندێک رووەوە وێنەگرەکە راستی دەکرد، چونکە من پەیڕەوی ئەو نەریتانەی فیلمسازیم نەدەکرد، کە ئەو لەسەریان راهاتبوو. ئەو پێداگیریی لەسەر بڕینو هەڵوەشاندنەوەی دیمەنەکان دەکرد. بۆ نموونە، دەیویست بە گرتەیەکی دوور نزیکبوونەوەی منداڵەکە وێنە بگرێت، پاشان بە گرتەیەکی نزیک دەستی منداڵەکە وێنە بگرێت. کاتێک دەڕواتە ناوماڵەکەوەو دەرگاکە دادەخات، گرتەیەکی سەگەکە دەبینین کە لای دەرگاکەدا نووستووە. بەڵام من پێموابوو ئەگەر منداڵەکەو سەگەکە لە گرتەیەکەدا دەربکەون، بە مانای ئەوەی رۆشتنە ژوورەوەی منداڵەکە بۆ ناو ماڵەکەو گەڕانەوەی سەگەکە بۆ

خەوتن لای دەرگاکەدا لە کادردا دەربکەون، ئەو کاتە کاریگەرییەکەی قووڵتر دەبێت.

پێموایە ئەوە زەحمەتترین گرتەی درێژم بوو بە درێژایی کارکردنم لە فیلمسازیدا. دەبوو لە پێناوی ئەم گرتەیەدا چل رۆژ چاوەڕێمان بکردایە. سێ جار سەگەکەمان گۆڕی (یەکێک لە سەگەکان تووشی هاری بوو). بەڵام سەرباری هەموو ئەو ئاستەنگانەی رووبەڕوویان بووینەوە، توانیمان لە وێنەگرتنی ئەو گرتەیەدا کە دەمویست، سەربکەوین. بەشی زۆری ئەم فیلمە، بە جۆرێک لە جۆرەکان، دەرەنجامی بێزانیاریبوونی من بوو سەربارەت بە نەریتو عورفە سینەماییەکان. ئێستا کە بیری لێدەکەوە، دەگەمە ئەو ئەنجامەی کە بڕیارە راستەکەم داوە. پێموایە هەڵوەشاندنەوەی دیمەنەکان (ئەگەرچی بەشداری لە تیمپۆی فیلمەکەدا دەکات) دەشێت بە ئاسانی زیان بە فۆرمو ناوەڕۆکی فیلم بگەیەنێت.

**چۆن بە تێپەڕینی کات شێوازی تایبەتی تۆ لە گێڕانەوەدا، تێڕوانینی سینەمایی و هەستکردنت بە تیمپۆ گەشەیکرد؟**

بە راستی نازانم. وەڵامدانەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە پێویستیان بە تێرامانێکی زۆر هەیە، پێموایە ئێستا کاتی پێویستمان بە دەستەوە نییە. بەڵام پێشموایە هەموو ئەوانەی باسمکردوون، بەرهەمی ترس بوون: ترس لە نەتوانایی، نەبوونی توانست، کاتێک لەگەڵ کامێراو ستافە هونەرییەکەدا لە شوێنی وێنەگرتندا دەبیت، کاتێک گۆڕان بەسەر زانیارییە تەکنیکییەکانتو تواناکانتدا دێن. لەم ساتانەی گومانو ترسدا رووبەڕووی خۆت دەبیتەوە. ئەمەش وات لێدەکات گەشە بکەیتو پێبگەیت.

پاش ئەوەی فیلمەکەت دروست دەکەیت، دەتوانیت دانیشیتو پشوو بدەیت، وەک هەر بینەرێکی دیکە سەیری بکەیتو بڕیار لەسەر توانای خۆت لە گێڕانەوەی چیرۆک یاخود ناوەڕۆکی فیلمەکەت بدەیت. تێڕوانینی مرۆڤ پێویستی بە کات هەیە بۆ ئەوەی ببێت بە شێوازێک. پێم وانییە هیچ کەسێک بتوانێت بڕیار لەسەر شێوازێکی دیاریکراو بدات هەتا پێشتر بە فیعلی ناوەندی هونەری تاقی نەکاتەوە. سەبارەت بە هەستکردنم بە تیمپۆ، دەڵێم هەرگیز رۆژێک لە رۆژان سەرسامی سینەمای بازرگانیو تیمپۆ خێراکانیو مەیلی ورژاندنی نەبووم. ژیانی تایبەتی من تیمپۆی خێرای تێدا نییە، من بە هێواشیو لەسەرخۆیی دەژیم. فیلمەکانم رەنگدانەوەی تیمپۆی منن لە ژیاندا.

**لە چ قۆناغێکی بەرهەمهێنان یان دوای بەرهەمهێناندا رەگەزە دەنگییەکان، بۆ نموونە مۆسیقا، گەڵاڵە دەکەیت؟ لە قۆناغی مۆنتاژدا یان پێشتر؟**

هەرگیز لە قۆناغی مۆنتاژدا بیر لە دەنگ ناکەمەوە. رەنگە لە کاتی مۆنتاژدا هەندێک گۆڕانکاریی لاوەکی روو بدەن، بەڵام دەنگ پێش قۆناغی مۆنتاژ گەڵاڵە دەبێت.

**تەنانەت مۆسیقاش؟**

بێگومان مۆسیقاش. من مۆسیقای تایبەت بۆ فیلمەکانم بەکارناهێنم. ئەگەر پێویست بوو مۆسیقا بەکاربهێنم، ئەوا لە کۆتاییدا دەبێت. لەم حاڵەتەدا دەزانم پێویستم بە بەکارهێنانی چ ئامێرێکی مۆسیقی هەیە. ئەگەر پارچە مۆسیقایەکم هەڵبژارد، یاخود داوام لە مۆسیقارێک کرد پارچەیەکم بۆ دابنێت، ئەوا دەبێت دەسەڵاتی تەواوم هەبێت. هەرگیز بوێریی ئەوەم نەکردووە فیلمێکم بدەم بە مۆسیقارێکو داوای لێبکەم مۆسیقای بۆ دابنێت. ئەمە لە هاوسەرگیریکردن لە رێگای پۆستەوە مەترسیدارترە. کاتێک کار لەسەر مۆنتاژکردنی سادەترین دەنگ دەکەیت، بۆ نموونە دەنگی مێروویەک یان باڵدارێک کە بەسەر مایکرۆفۆنەکەدا دەفڕێت، چۆن دەتوانیت رێگە بدەیت کەسێکی دیکە پارچە مۆسیقایەکی تەواو بەسەر فیلمەکەتدا بسەپێنێت؟

**لە تایبەتمەندییەکانی فیلمەکانی تۆ (تەنانەت لە فیلمە سەرەتاییەکانیشتدا وەک فیلمی گەشتیار) بەکارهێنانی دەنگی دەرەکییە، بە تایبەتی مۆنۆلۆگو دیالۆگ. من وەک خۆم پێموایە لە فیلمی (با لەگەڵ خۆیدا دەمانبات)دا زیاد لە پێویست ئەم تەکنیکەت بەکارهێناوە. ئایا دەشێت زیاد لە پێویست ئەم میکانیزمە لە گەیاندنی پەیامەکەدا بەکاربهێنیت؟**

بێگومان. لە راستیدا من دەمەوێت ئەمە بکەم. پێموایە کاتێک ناتوانین وردەکاریی تەواوەتیی شتەکان ببینین، ئەو کاتە کاریگەرییەکانیان بەهێزتر دەبێت، سەرنجەکان بۆ ماوەیەکی درێژتر بەردەوام دەبن. هاوکات ئەمە دەرفەت بە بینەر دەدات خەیاڵی خۆی بەکاربهێنێت: تەنیا ئەوەی دەنگێک ببیستن، دەتوانن لە زەینی داهێنەری خۆیاندا وێنەکان ببینن، تەنانەت بەبێ ئەوەی لەسەر شاشەش ئەو وێنانە ببینن. لە راستیدا ئەمە بانگهێشتکردنی بینەرانە بۆ بەشداریکردن لە خوڵقاندنی کارەکەدا.

من حەسوودی بەو کەسانە دەبەم کە دەتوانن بە هۆی بەکارهێنانی خەیاڵی خۆیانەوە، کە لە خەیاڵی بینەرانی سینەما فراوانترە، رۆمان بخوێننەوە. ئەگەر بتوانرایە فیلم وەک "شێوازی چاپکردنی کتێب" دروست بکرایە، ئەو کاتە فیلمەکە تەواوتر دەبوو. بۆ نموونە دەشێت چوار دێری کۆتایی بەشێک لە لای سەرەوەی لاپەڕەکەدا کۆتایی بێت، لە کاتێکدا پاشماوەی لاپەڕەکە خاڵیو سپییە، لاپەڕەی دواتریش لە تەنیشتییەوە دەبێت. ئەو کاتەش لاپەڕە تازەکە بە ناونیشانێکی کورت دەستپێدەکات. ئەم جۆرە دیزاینە دەرفەتت پێدەدات کەمێک بوەستیتو بیر بکەیتەوە. زۆر جار سەرسام دەبم کە دەبیستم هەندێک کەس دەڵێن: "کتێبەکەم بە دەستەوە گرتو خوێندمەوە، نەمتوانی وازی لێبهێنم هەتا هەموویم نەخوێندەوە". چۆن دەشێت ئەمە بە تایبەتمەندییەکی باشی بەرهەمی هونەری دابنرێت؟ ئەمە هەمان وروژاندنی رواڵەتییانەیە کە سینەمای باو بەسەر بینەرەکانیدا دەیسەپێنێت.

دەبێت سینەما بتوانێت ئەم جۆرە ئازادییە بۆ هونەرمەندو بینەریش دابین بکات. کاتێک سەرقاڵی "با لەگەڵ خۆیدا دەمانبات" بووم، هەستم بە قەبارەی ئەو بێزارییە دەکرد، کە بینینی هەڵشاخانی چەندجارەی کەسێک بەسەر گردەکەدا دەبووە هۆی دروستبوونی. بەڵام ئەوەی کە پاڵنەری ئەم رووبەڕووبوونەوەیە بوو، ئەوە بوو کە دەمویست ئەم بێزارییە دروست بکەم. دەمەوێت بێزارییت بوروژێنم. کەسێتییەکانی فیلمەکەش بێزارن. هیچ شتێک روو نادات، تەنیا هەندێک شتی ئاساییو هەندێک دیمەنی جوان. تەنانەت کەسێتیی سەرەکیی فیلمەکەش چاوەڕوانی روودانی شتێکە. لە راستیدا روونەدانی هیچ شتێک دەبێتە هۆی دروستبوونی جۆرێک لە چاوەڕوانیکردن. دواتر رووداوێکی بچووک، بۆ نموونە داتەپینی بیرێک، دەبێتە شتێکی گرنگ لەم چیرۆکەدا. هەندێکجار پێویستت بەم رووبەرە بۆشانە هەیە بۆ ئەوەی وا لە بینەرەکانت بکەیت زیاتر بکرێنەوەو هەستیارتر بن. لەوانەیە ئەمە لە بەشە جیاوازەکانی رۆمان بچێت.

ئەو کەسەی کە رۆمـان دەنووسێت، لە پیتی یەکەمەوە هەتا کۆتایی دەینووسێت، پاشان بەسەر چەند بەشێکی جیاوازدا دابەشی دەکات بۆئەوەی حاڵەتو کەشی خوازراو دروست بکات. بەڵام سینەمای نەریتی وا نەکات، بەو پێیەی دەیەوێت بینەر وەک بارمتە بگرێتو ئەوەی کە خۆی دەیبینێت، بیسەپێنێت بەسەریاندا. بە دەربڕینێکی دیکە، رێکەوتنێکی پێشتر لە قووتوونراویان لەگەڵ پەیامێکی دیاریکراو و کۆتاییەکی داخراودا پێشکەش دەکات. لەبەر ئەوەش بەرگەی ساتە کراوەو سادەو بەدەر لە رووداوە گرنگەکان ناکات. بینەر لەگەڵ

ئەم جۆرە سینەمایەدا ڕاهاتووە. کاتێک بینەران ڕووبەڕووی کۆتایی کراوە دەبنەوە، دەشڵەژێن‌و سەریان لێدەشێوێت. هەندێکجار گوێت لە بینەرێک دەبێت دەڵێت "دەتوانم لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی فیلمەکە تێبگەم، بەڵام نەمتوانی لە دیمەنی کۆتایی تێبگەم".

لەگەڵ ئەوەشدا پێموایە ئەگەر نەتوانیت لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی فیلمەکە ببینیت، لەبەر هەر هۆکارێک بێت، دەبێت هەست بەوە بکەیت ئەوەی بینیووتە، بەسە. پێویستە دیمەن لە ناوخۆیدا هەڵگری پرەنسیپی بەسبوونی خودی بێت. لە ڕابردوودا، کاتێک فیلمم دەبینی، وا ڕاهاتبووم لە پاش بینینی دیمەنێکی کارتێکەر یان هەستبزوێن هۆڵی سینەما جێبهێڵم. ئەو ساتە تایبەتانە تێری دەکردم‌و ڕۆژەکەی پڕ دەکردم، خواستێکی بەهێزم نەبوو بۆ تەواوکردنی فیلمەکەو بینینی هەتا کۆتایی. چاوەڕێی هیچ دەرەنجامێک یان بڕیارێکی کۆتاییم لەسەر کەسێتییەکان نەدەکرد، جا ئەگەر کەسێتیی باش بوونایە یان خراپ.

**پێم وانییە باوەڕت بەو سینەمایە هەبێت، کە هەڵگری پەیامێکی دیاریکراوە؟**

تەواو وایە. سینەما شوێنی بڵاوکردنەوەو گەیاندنی پەیام نییە. هونەرمەند بەرهەمێکی هونەری دیزاین دەکات‌و پلانی بۆ دادەنێت‌و دەیخوڵقێنێت، هیوادار دەبێت لە میانەیەوە هەندێک بیرۆکەو چەمک‌و هەست بەرجەستە بکات. ڕاستگۆیی شاعیرە مەزنە فارسەکان بۆ نموونە ڕۆمی‌و حافز، لەو حەقیقەتەوە سەرچاوە دەگرێت کە شیعرەکانیان بەشێوەیەکی وا نووسیوە، کە هەمیشە نوێ‌و پڕ لە مانان بە چاوپۆشی لەو شوێن‌و کات‌و حاڵەتانەی کە شیعرەکانی تیادا دەخوێنیتەوە. ئەمە بۆ هەندێک لە شاعیرە هاوچەرخەکانیشمان ڕاستە، بۆ نموونە فروغ فروغزاد.

کاتێک لە بەردەم تابلۆیەکی ئەبستراکتدا دەوەستین، دەتوانین بە هەرشێک بمانەوێت، ڕاڤەی بکەین. یاخود مۆسیقا، مۆسیقا ناوەندێکی هونەرییە کە لەوانەیە لێی تێنەگەین، بەڵام هەستی پێدەکەین‌و چێژی لێوەردەگرین. بەڵام کاتێک دێین بۆ سینەما، هەمووان چاوەڕێی ئەوە دەکەن پەیامێکی یەکخراو و ڕوون وەربگرن. ئەوەی کە دەمەوێت بیڵێم، ئەوەیە کە دەشێت فیلم وەک قەسیدەیەک، تابلۆیەک یان پارچە مۆسیقایەک تاقیبکرێتەوە.

**وەک داهێنەرێکە تا چەند گراوەیت لە ئاستی ئەو ڕاڤە جیاوازانەدا کە بۆ بەرهەمەکانت دەکرێن؟ بۆ نموونە، دەشێت مرۆڤ وا سەیری گرتەکانی سەرەتای**

**فیلمی (تامی گێلاس) بکات، وەک ئەوەی هەندێک مانای زیادە لە خۆیان بگرنو ئاماژە بۆ هۆمۆسێکسوالێتی بکەن. تۆ چۆن ئەمە دەبینیت؟**

کەسانێک دەناسم کە تەواوی فیلمەکەیان لە روانگەی هۆمۆسێکسوالێتییەوە سەیرکردووە. بە باوەڕی من هەموو کەسێک مافی ئەوەی هەیە فیلمەکە بەو شێوازە بخوێنێتەوە کە لێی تێدەگات، یان حەز دەکات لێی تێبگات. بیرمە پاش نمایشکردنی فیلمی (ماڵی دۆست لە کوێیە؟) کەسێک بە یەکێک لە هاوڕێکانمی وتبوو ئەم فیلمە زۆر سیاسییە. کاتێک هاوڕێکەم لێی پرسیبوو بۆچی؟ وتبووی کەسێتیی فیلمەکە ناوی (محەمەد رەزا نیعمەت زادە)یە، محەمەد رەزا ناوی دواهەمین شای ئێرانە. سەبارەت بە ناوی خێزانەکەش (نیعمەت زادە) مانای نیعمەت یان خەڵاتی خودایە. دواتر بۆم دەرکەوت ئەم کەسە لە تەلەفزیۆنی ئێراندا کاری دەکردو پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران لەسەر کارەکەی دەرکراوە.

دەبێت فیلم فرەرەهەندو فرەچین بێت، بینەر هەر پاشخان یان ئاڕاستەیەکی هەبێت، بتوانێت پەیوەندیی لەگەڵدا دروست بکات. کێ مافی ئەوەی هەیە بڵێت "نەخێر"و خۆی بێبەش بکات لەو رێگایەی کە حەز دەکات لە میانەیەوە فیلمەکە ببینێتو بخوێنێتەوە؟

**ئێستا کە سەیری فیلمە کۆنەکانت دەکەیت چ هەستێکت هەیە بەرامبەریان. بۆ نموونە فیلمی گەشتیار کە یەکەم فیلمی تۆیە؟**

چەند ساڵێک پێشتر، پاش بیست ساڵ لە دروستکردنی فیلمەکە، لە فێستیڤاڵێک لە ژاپۆن فیلمەکەم بینی. هێشتا نوێبوو، هێشتا بینەر دەیتوانی لەگەڵیدا بگونجێت. بەڵام نەخێر، فیلمەکانم هەرگیز تەواو نین، هەمیشە رووبەڕووی کێشەو ئاستەنگ دەبنەوە. دەبێت بڵێم ئەمە تەنیا پەیوەندیی بە فیلمە کۆنەکانمەوە نییە، چونکە کەموکورتیو خەوشەکان حەتمینو هیچ رێگایەک نییە بۆ ئەوەی خۆتیان لێ لابدەیت. هۆی ئەمەش کەموکورتی زانیارییەکانت نییە سەبارەت بە کارەکەت. بە تایبەتی کاتێک لەگەڵ کەسانێکدا کار دەکەیت کە ئەکتەر نینو لە ژینگەی رۆژانەدا کاریان لەگەڵ دەکەیت، ئەو کاتە ناتوانیت کۆنترۆڵی تەواوەتیت هەبێت بەسەر هەموو شتێکدا.

دەشێت ئەم خەوشانە بە کەموکورتی یان بە فەزیلەتی فیلم دابنرێن. ئەگەر ئەمڕۆ ناچار بم جارێکی دیکە فیلمی "گەشتیار" دروست بکەمەوە، ئەوا لەوانەیە بتوانم هەندێک سات راست بکەمەوە، بەڵام بێگومان فیلمەکە هەندێک ساتی مەزنیش لە دەست دەدات. ئەم فیلمانە لە رابردوودا دروستکراونو سەر بەو ساتو قۆناغانەن.

**پرۆسەی داهێنان لای تۆ پێویستی بە چەندێک هونەرو فەلسەفەو سۆسیۆلۆجیاو تیۆری سیاسی هەیە؟**

هەموو ئەو شتانەی کە دەشێت تیۆرەکان بۆم دابین بکەن، دەبێت ماوەیەک پێش ئەوەی برۆمە پشت کامێرا، بۆم دابین بکەن. لەو کاتەدا دەبێت مرۆڤ ئەو شتانەی کە پێش دەستکردن بە کارە هونەرەکە خوێندوونیەتییەوەو فێری بوون، هەرس بکاتو لێیان تێبگات. ئەگەر مرۆڤ لە هەندێک تیۆرو چەمکو بابەتی فەلسەفی تێبگات، ئەوا ئەو شتانە بەشێوەیەکی وردو لێزانانە لە بەرهەمەکەیدا دەردەکەون. کاردانەوەی خێراو سۆزدارانە بەرامبەر پرسە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان فیلم دەگۆڕێت بۆ رۆژنامەیەکی کۆن. کاتێک ئەو ئاڵۆزییە کۆمەڵایەتییانەی ناو فیلم دەگۆڕێنو کۆتاییان دێت، فیلمەکەش بێبەها دەبێت. کەواتە دەرهێنەر فیلمێک دروست دەکات، کە پڕە لە هزری کاڵو کرچو لە تێگەیشتن بەدەر لەناو ئەجێنداکەیدا، ئەو کاتە فیلمەکە دەبێت بە دروشمێکی جووڵاو.

**کەواتە هونەرمەند بەشێوەیەکی نائاگاییانە لە پێش زەمەنی خۆیەوە دەژی؟**

دەبێت وابێت. ئەوە ئەرکی رۆژنامەنووسە کە دەبێت هەتا کاتژمێر چواری سەرلەبەیانی هەواڵ کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی رۆژی دواتر لە رۆژنامەکەیدا چاپیان بکات. بەلام هونەرمەند دەبوو پێش چەندین مانگو ساڵ ئەو هەوالانەی پێ بگات.



**سەرچاوە:**

http://www.cinematechhaddad.com/Cinematech/Cinematech_Special/Ameen/Ameen_New/Ameen_New.htm

# سینەمای ترس... بەرجەستەکردنی ترسەکان



**نووسینی: ئەمین سالْح**
**و. لە عەرەبییەوە: هێمن مەحمود حەسەن**

مرۆڤ کاتێک لە جیهانێکی ناعەقلانی شێواو و پڕ لە توندوتیژی و بێوەیدا دەژی ترسی لێدەنیشێت. کاتێک خۆی لە ناو بازنەیەکی پڕ لە ناکۆکی و ململانێدا دەبینێتە کە دروستکراوی دەستی مرۆڤن یان کاتێک لە نێو زنجیرەیەک کارەسات و پەتاو نەخۆشی پێشبینی نەکراودا دەژی کە لە ناکاو پەلاماری دەدەن بەبێ ئەوەی بتوانێت بەریان پێبگرێت یا رووبەڕوویان بێتەوە. مرۆڤ هەست دەکات هەڕەشەیەکی بەردەوامی لەسەرە، ئەگەر لەگەڵ کەسوکاری خۆی و دەوروبەریدا نەبێت ئەوا لەوانەیە فشار و کارتێکەرەکان بەرەو نائومێدی و ئیفلیجبون و شێتی ببەن. لە کۆتاییدا وەک رێوشوێنێکی بەرگریکردن پەرچەکردارێکی وێرانکارانە لە دژ ئەوانی تر و خودی خۆی دەردەکەوێت. بەردەوام هەست بە ترس و گومان دەکات و بەدەست نائارامیەوە دەناڵێنێت، وەک چەمکێکی نادیار و تەمومژاوی لە دواڕۆژ دەڕوانێت، چونکە نازانێت لە چرکەساتی دواتردا چی روودەدات. شەڕ و برسێتی و کارەساتەکانیش دێن و لەلایەن خۆیانەوە ترسە گشتی و تایبەتییەکان تۆختر دەکەنەوە. ترس رەمەکێک یان وارِسکێکی بەهێز و

کاریگەرە. ڕەگوڕیشەکانی لە ناو مرۆڤدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵێ کە بۆ یەکەمجار لە ڕێگەی زنجیرەیەک بەربەست و شتی قەدەغەکراوەوە هەستەکانی گوناە و گومان تاقی دەکاتەوە کە هاوکاتە لەگەڵ ترساندن و هەڕەشەی ئەشکەنجەدان لە چەند شێوازێکی مادیدا کە ئەفسانە سەرچاوەکەیانە. لێرەدا ترساندن و هەڕەشەی ئەشکەنجەدان پەیوەندیەکی پڕ لە وریابوون و ترس و گومان لە نێوان منداڵ و دەوروبەریدا دروست دەکات، بە تایبەت لەگەڵ ئەو شتە سامناکانەی دەوروبەری یان ئەو شتە سامناکانەی کە لە دەرەوەی سنوری درک پێکردنی ئەون وەکو هێزگەلێکی شاراوە کە چاودێری دەکەن و خۆیان بۆ مەڵاسداوە و چاوەڕوانن هەڵەیەک یا کردارێکی نەشیاو بکات و پەلاماری بدەن. چونکە ترسەکان پێویستیان بە بوارێک یا دەریچەیەکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت تاقیان بکاتەوە یان ڕووبەڕوویان بێتەوە یان هێوریان بکاتەوە یان بیانبەزێنێت. ئەو ئامرازانەشی کە ئەو مەبەستە دەپێکن لە چیرۆکە ئەفسانەییەکان و میتۆلۆجیا و چیرۆک و فیلمی ترسدا دەردەکەون. پەروەشی منداڵیش بۆ چیرۆکە ئەفسانەییەکان بۆ ئەوە دروستبووە کە ئەو پێداویستییە تێربکات، لە ناوەرۆکدا کۆمەڵە چیرۆکێکی سامناکن، بەڵام لە ڕێگەی گاڵتەوگەپ و کەشوهەوای سەرکێشانە و خەیاڵی منداڵانە و مانای ڕەوشتیەوە شێوەکەیان گۆڕاوە. لە چیرۆکەکاندا سەرجەم ڕوخسارەکانی ترس و تۆقین بەدیدەکەین: ئەفسون و خێو و دێو و درنج و گۆڕانی مرۆڤەکان و هێزی شاراوە و نائاسایی. چیرۆکەکانی هەزار و یەک شەوەش پڕن لە ترس و تۆقین. نادیار، سەرچاوەی سەرەکی ترسە. ئەو نادیارەی کە لە ناو دەریادا خۆی مەڵاسداوە و زیاد لە چەندین شێوە و ڕوخساری هەیە، ئەو نادیارەی کە لە ڕێگەی چیرۆکی ئایینی و ئەفسانە و فۆلکلۆرەوە ڕەگ و ریشە لە کۆنەستی گشتیماندا هەیە، یان ئەو نادیارەی کە لە قوڵایی ناخدایە و لە وزەیەکی نەستیدا دەردەکەوێت کە بە هۆی شێوازە جۆراوجۆرەکانی چەپاندنەوە دروست بووە و چاوەڕوانی هەلێکە بۆ ئەوەی بتەقێتەوە و بەچەندین شێوازی وێرانکارانە گوزارشت لە خۆی بکات. چیرۆک و فیلمەکانی تر بە شێوازی جۆراوجۆرە، ئەو ترسە نادیارە دەقۆزنەوە. دێو و درنج و ئاژەڵی دڕندە و شێت و پیاوکوژ و خوێنمژەکان و بونەوەری ئاسمانی و هەرچی بونەوەری تری ناو جیهانی چیرۆک و فیلمەکانی ترس هەیە هەمویان ڕەنگدانەوەی ترس و ناکۆکی و ململانێکانی خۆمانن. دێو

یان هەر بونەوەرێکی تری شەڕخواز کە هەرەشەدەکات دەکرێت لە ڕێگەی شیکردنەوەی دەرونناسیەوە ئەو وزە شاراوەی نەست بێت یان ئەو خودەی تر بێت کە لەلایەن نۆرم و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەوە چەپێندراوە، ئەو خودەی کە هەوڵدەدات خۆی لە دیلێتی ئەو دابونەریتانە رزگار بکات و لە هەمان کاتیشدا هەوڵی لە ناوبردنیان دەدات. لەلایەکی ترەوە دێو یان هەر بونەوەرێکی تر ئەو ترسە بێ پاساو و ناعەقڵانییە شاراوەی ناو ناخی مرۆڤ بەرجەستە دەکات کە لە شێوەیەکی نامۆ یان نارێک و ناشرینندا دەردەکەوێت. لەلایەکی ترەوە و وەک راڤەیەک دەکرێت وەک سروتێکی ئارەزوە چەپێندراوەکان سەیری فیلمەکانی ترس بکرێت. فیلمەکانی ترس لە شێوە و کەشەکانیدا نوێنەرایەتی دێوزمەکانن، بەڵام لە بونیادی ناو فیلمەکەدا جیاوازە، کە سیستەمێکی عەقڵانی پەیڕەو دەکات و ملکەچی کۆنترۆڵکردن و رێکخستن و هەماهەنگکردنە. ئێمە هەمان تایبەتمەندی لە (ترسی سینەمایی و خەونی ناخۆشدا) بەدی دەکەین، حەسانەت نییە و لەوانەیە ببیت بە تەڵەوە، ترست لێدەنیشێت و لەبەردەم دەسەڵاتێکی شەڕانگێز و ستەمکاردا کە هیچی لێتێناگەیت دەستەوەستان دەوەستیت. واتە سینەمای ترس بەرجەستەکردنی دێوەزمەکانی خۆمانە و شتێک دەهێنێتەوە ناو هەست کە چەپێندراو بووە. رەخنەگرو و توێژەر (رۆبن







وود) دەڵێت: بناغەی گرنگیپێدان و سەرسامبونی خەڵک بە فیلمەکانی ترس، ئـارەزوی دێوەزمەئاسای خۆمانە بۆ لەناوبردنی ئەو پێوەرانەی کە دەمانچەپێنن. حاڵەتی گوێڕایەڵبوون بە واتای (ملکەچکردن بۆ پێودانگە کۆمەلأیەتییەکان) خۆی لە خێزان و دامەزراوە کۆمەلأیەتییەکان و سیستمدا دەبینێتەوە، سیستم بە هێماو دامودەزگاکانییەوە. ئەو لایەنانە بەردەوام لە ژێر هەڕەشەدان و لەلایەن ئەوی ترەوە هەوڵی بڕین و پێشێلکردنیان دەدرێت، ئەوی تر خۆی لە هەموو ئەو شتانەدا دەبینێتەوە کە ئاژاوەچی و شەڕانگێز و لاسارن و بە چەندین شێوە و روخساری جیاواز دەردەکەون ،وەکو دێو و خوێنمژ و ئاژەڵ و پەلەوەر و گیانەوەری ئاوی و شێت و ئەوانەی کە جنۆکە چۆتە ناو لەشیانەوە. لە ئەنجامدا بەردەوام ململانێیەک لە نێوان کەسی باش و خراپ، شەڕ و چاکە، سیستم و پشێوی، پاک و پیس، چاوتێر و چاوبرسی، هەست و نەست، رووناکی و تاریکی، ژیان و مردندا هەیە. پەلاماردانی حاڵەتی باش و رێک بە تەواوی هێما و روخسار و پێدانەکانییەوە تایبەتمەندیەکی وێرانکاریانەی دەگمەن و رەهەندێکی شۆڕشگێڕانە بە سینەما دەبەخشێت کە وێنەی لە جۆرەکانی تری سینەمادا کەمە. کاتێک ئەو فیلمانە وەک مادە و کاراکتەر و پەیوەندیەکان دەخەینە ژێر شیکردنەوەی دەرونییەوە هێماگەلێکی سایکۆلۆژی دەبینین کە پەیوەندیان بە تاپۆی سێکسی و ئاینییەوە هەیە. سینەمای ترس سنور دەبڕێت و وێرانی دەکات، دەگاتە سنورەکانی واقیع و ئەفسانە، راستی و وەهم، کردار و مەحاڵ، بینراو و نەبینراو، ژیان و مردن، ئێستا و مێژوو. ئا لێرەدا هیچ سنور و بەربەستێک نییە. خەڵک تەماشای فیلمەکانی ترس دەکات بۆ ئەوەی هەستەکانی ترس و هێدمە تاقی بکاتەوە. فیلمەکان هەروەک ئاماژمان پێکرد وەکو چیرۆکە ئەفسانەییەکان وان، ئامرازێکن بۆ دەرکردنی ترسە شاراوەکان. بینەر لە رێگەی تەماشاکردنەوە چێژێکی زۆر وەردەگرێت، چێژی منداڵێک کە بە پەرۆشەوە گوێ لە چیرۆکە ئەفسانەییەکان دەگرێت و ترسی لێدەنیشێت. لە ساتەوەختە ناخۆشەکاندا کە پڕن لە قەیران و رووبەڕووبونەوەی توند و کارەساتەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە لە نان و ساتدان، تێبینی ئەوە دەکەین کە فیلمەکانی ترس لە بوژانەوەدان و خەڵکێکی زۆر تەماشایان دەکەن. لەو کاتەدا هەستکردنێکی گشتی بە ئیفلیجبون و بێدەسەلأتی و نیگەرانی لە ئارادایە و جەماوەر تەنیا لە رێگەی فیلمەکانی ترسەوە دەتوانن گوزارشت لە ترس و نیگەرانیەکانیان

بکەن کە بەرجەستەکردنی دێوەزمەیەکی راستەقینەی ناو خەیاڵەکانی مروڤن. لە کاتێکدا کە خەڵکی حەز لەو فیلمانە دەکەن و پشتیوانیان لێدەکەن، رەخنەگران بە چاوێکی سوکەوە تەماشایان دەکەن یان پشتگوێیان دەخەن و رەتیان دەکەنەوە بە شتێکی بێ مانا و پروپوچ و قێزەوەنیان لە قەڵەم دەدەن. ژمارەیەکی کەم لە رەخنەگران لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لە بارەی ئەو سینەمایەوە کردوە و کۆمەڵێک رەگەز و تایبەتمەندی وەهایان تێدا دۆزیونەتەوە کە شایەنی تێرامانن، کۆمەڵێک پەیوەندی بەهێزیان لە نێوان هێماکانی ناو فیلمەکان و ئەو بابەتانەی ناو دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا دۆزیـەوە کە لێکۆڵینەوەیان لە بارەوە کراوە. لە نێو ئەو هەموو فیلمە بازرگانیەدا کە بابەتەکانیان بێزارکەر و دوبـارەبـوەن و بە پەلە دروستکراون و فرێدراونەتە ناو بازاڕەوە بەبێ ئەوەی باس لە بابەتێکی جدی بکەن یاخود بەهایەکی هونەری و فیکریان هەبێت، لە نێو ئەو هەموو فیلمانەوە چەند فیلمێک دەردەکەون کە هەڵگری کۆمەڵێک هێما و مانای سایکۆلۆژی و فەلسەفین و دەکرێت چەندین شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیان بۆ بکرێت. وەکو فیلمەکانی سایکۆ هی (هیچکۆک)، دورکەوتنەوە هی (بۆلانسکی)، بێتاوانەکان هی (جاک کلایتۆن)، بریقەدانەوە هی (ستانلی کۆبریک)، ئەوانە کۆمەڵە فیلمێکی بە نرخن و لە رووی هونەرییەوە بە پێزن، تێروانین و شێوازێکی داهێنەرانەیان هەیە و کۆمەڵە بابەتێک دەخەنەڕوو کە بیروبۆچونی جیاواز هەڵدەگرن. بۆ ئەوە دروست نەکراون کە جەماوەر بترسێنن یان بیانوروژێنن، بەڵکو کۆمەڵە پرسێکی گرنگ لە بارەی خود و ئەوی تر و شتە چەپێندراوەکانەوە چارەسەر دەکەن. کاردانەوەی جەماوەر لە بەرامبەر فیلمەکانی ترسدا دوو لایەنیە: لە یەک کاتدا هەست بە ترس و سەرسامبون دەکـات. هەستی رەوشتی وای لێدەکات قێز لە کارە شەڕخوازەکانی دێو بکاتەوە و ترسی لێبنیشێت، کەچی لەلایەکی ترەوە لەگەڵ بەشە شاراوەکەی ناخیدا هاوسۆزە کە پێیوایە کردەوەکانی دێوەکە رەنگدانەوەی ئارەزویەکی نێژراون بۆ لەناوبردنی هەر شتێک کە سەرکوتکار و داپڵۆسێنەرە. حەز و ئارەزوەکانی جەماوەر بە تێپەڕبونی کات دەگۆڕێن و لەگەڵ خۆشیاندا کۆمەڵگا دەگـۆڕن، ئەو شتەی کە لە قۆناغێکی دیاریکراودا وروژێنەر و تۆقێنەر بوو لە قۆناغی دواتردا وا نابێت. لەبەرئەوەی سینەماش بەردەوام ئارەزوی جەماوەرە بە جێدەهێنێت و حەز و پێداویستیەکانی ئەو رەچاو دەکات، بەردەوام شتێک دادەهێنێت

کە جیاواز و دژە. لە فیلمەکانی ترسدا ئەو شیکردنەوانەی کە لە سنورێکی تەسکدا لە بارەی ڕووداوەکان و بونەوەرەکان و شتە نائاساییەکانەوە پێشکەش دەکرێن، فزولی بینەر تێرناکەن، بەڵکو لێڵی و ناڕوونی زیاتر دەکەن و چەندین راڤەی جیاواز بۆ بابەتەکە دەکرێت. تاکەکان خۆیان لە پشتی ماسکەکانەوە دەشارنەوە، شتەکان وەکو خۆیان دەرناکەون، روخسارەکان وا دەردەکەون کە فریودەربن. لە ژێرەوە ڕووییەکی تر هەیە، ڕووییەکی نهێنی و شاراوە کە هەڕەشە دەکات. کەس نییە بتوانێت چارەنوسی خۆی دیاری بکات و ڕووداوەکان کۆنترۆڵ بکات. نە ئەوی تری شەڕخواز و نە قوربانییەکان. ڕەگەزی مرۆڤایەتی بەبێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی هەبێت بەرەو سەرلێشێوان و پشێوییەکی تەواو دەڕوات.



**سەرچاوە:**

سینماتک